# حوکمی تەعزیە گێڕان لەئیسلامدا

پێداچونەوەی بەڕێز

مامۆستا هوشیار احمد محمد

پێش نوێژو وتار خوێنی مزگەوتی گەورەی ئازادی لە بازیان

ئامادەکردن و نوسینی

زانا عثمان پێنجوێنی



چاپی یەکەم

۲۰۱۳ ز

١٤٣٤هـ

# حوكمی تەعزیە گێڕان

# لەئیسلامدا

## لەگەڵ چۆنێتی( وەسێتی شەرعی )

نوسینی بەڕێزمامۆستا یحیی ستار شێخانی

پێداچونەوەی بەڕێز

مامۆستا هوشیار ئەحمەد محمد

ئامادەکردن و کۆکردنەوە و نوسینی

زاناعثمان پێنجوێنی

١٤٣٢ك ٢٠١١م

پێناسی کتێب:

ناوی کتێب: حوکمی تەعزیە گێڕان لە ئیسلامدا.

پێداچونەوە: بەڕێز مامۆستا (هوشیار أحمد محمد) پێش نوێژو وتارخوێنی (مزگەوتی گەورەی ئازادی لە بازیان)

ناوی نوسەر: زانـا عثمان پێنجوێنی.

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم/ ١٤٣٤ ك – ٢٠١٣ ز

چاپخانەی: زانا سلیمانی شه قامی مولوی

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە.

ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان–سلێمانی ژمارەی سپاردنی(١١٧٦)ی ساڵی(٢٠١٣)ی پێدراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

قال تعالى:(الْيوم أكْمَلتُ لكمْ دِينَكمْ وأتْمَمَتُ عَليكُم نِعْمتي وَرَضِيتُ لَكُمُ الأسلامَ دِيناً).

الحمدُللّه رّبِ العالَمينْ ,وَألعاقِبة للْمتقين, ولاعُدوان إلاّ على الظالمين, وأشهدأن لاإله إلا الله وحدهُ لاشريْك لَه قيوم السموات والأرضين وذ والألُوهية والعبودية على خلقهِ أجمعين.

وأشهُدأن محمدّاً عبدهُ ورسُولُهُ خاتم النبيين وإمام المتقينﷺوعلى آلهِ وصحبهِ الطيبين الطاهرين وسادةً العالمين بعد النبيين والمرُسلين وسلم تسليماً كثيراً على مر الأيام والليالي والسنن.

أماَ بَعَدْ:فإنَ خَير الحديث كتاب الله وخيرالهدي هدي مُحَمدﷺوشرّ الأمور مُحَدثاّتها وكل محدثةٍ بدعة وكُل بدعةٍ ضلالة وكل ضلالةٍ في النارْ.

## پێشەکی

براو خوشکی موسوڵمان خوای گەورە زیاتر ڕێنمونی هەموو لایەك بکات بۆ ڕ ێگە ڕاستەکەی خۆی کەئیسلامە و تێمان بگەیەنێت لەو دینە حەقە...

شتێکی ئاشکرا و ڕونە کە دینی ئیسلام کۆتا بەرنامە و پەیامی خوایە بۆ گشت جنۆکە و مرۆڤەکان لەسەر ئەم زەویەدا، بۆیە پێویستە لەسەر هەرکەسێك کەباوەڕی بە ئیسلام هێناوە گوێڕایەڵیشی بکات لەهەموو کاروبارە کانی ژیانیدا، لەبەر ئەوەی کە ئەم دینە حەقەکەئیسلامە تەنها باسی عیبادەت و پەیوەندی بەندە بەخواوە نیە، وەك کۆمەڵێك لە بێباوەڕان ونەفامان واگومان دەبەن، بەڵکو گشتگیرو فراوانە و هەموو بەشەکانی ژیان دەگرێتەوە، بۆیە لە هەموو کاروبارەکانماندا پێویستە لەسەرمان کە ئەو ووتە و کردارەی دەمانەوێت ئەنجامی بدەین لەپێشدا دەبێت بیدەینە ژێرڕۆشنای

قورئانەکەی خوا و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بزانین چۆن باسیان لێوە کردووە، ئایا ئەوکارەمان پشتی بە بەڵگەی شەرعی بەستووە یان لەسەر هەوا و ئارەزوو دامەزراوە"پەنا بەخوا"، ئا یا ئەوکارەپێغەمبەری خوا ﷺ چۆن فەرمویەتی و چۆن ئەنجامی داوە!!

جایەکێك لەوکردارانە کەزۆر باوە لەناو موسوڵمانان‌دا لەم ڕۆژگارەدا کەبریتی یە لە(تەعزیە)گێڕان(واتە کەسێك کەکەسێکی لێدەمرێت تەعزیەوپرسەی بۆدەگێڕێت جا لە ماڵدا بێت یاخود لەمزگەوتدا بێت یاخود لەژێرخێمە وهەرشوێنێکی تردابێت...)

پێویستە ئەم کردارە شەڕە بناسین تاخۆمانی لێبپارێزین:

قال الشاعر:

عرفت الشر لا للشر     لكن لتوقيه

ومن لايعرف الخير     من الشر يقع فيه

وفي حديث حذيفة بن اليمان قال:(كان الناس يسألون رسـول الله عـن الخـــير، وكنـــت أســـأل عـــن الـــشر مخافـــة أن يدركني)البخاري(١٣/٢٩٩)ومسلم(١٨٤٧)

پێویسته لـەسەرمان بزانین کەئایا حوکمی شـەرعی چـی یـە لـەبارەی (تـەعـزیـەگـێـڕانـەوە) تاگوێڕایەڵی بکەین و چی تر شوێن هەواو ئارەزوی خۆمان و خەڵکی نـەزان و عـادەتی جـاهیلی نەکـەوین!!! ئێمە موسوڵمانین، هەربۆیە واجبە لـەسەرمان شوێن ئیـسلام بکـەوین، خۆئیسلامەتی هەر بەگوتن و ئیدعاکردن تەواو نابێت، بەڵکو لـەجێ بەجێ کردندا دەردەکەوێت.

ئایادەکرێت کەسێك بڵێـت مـن لـەفلان دائیـرە دامـەزراوم بـەلام نەکاری تێدادەکەم نـە فەرمانەکانیـشیان جـێ بـەجێ دێـنم موچـەش وەردەگرم ؟!!

بێگومــان شــتی وانابێــت و ئەگەروابکــەیت دەرت دەکــەن و هــیچ پەیوەندیت بەو دائیرەیەوە نامێنێت و موچەشــت پێنادرێــت, دەی تــۆ باهەر بڵێیت لـەودائیرەیەم چی سودێکی هەیە ؟!!

دەبێت بەوشێوازە تێبگەین لـەئیسلام، خۆناکرێت تـۆ هــەربڵێیت مــن موسوڵـمانم....من موسڵـمانم...

بەڵام تەسلیمی فەرمانی خواو پێغەمبەریشﷺ نـابم وگوێڕایەڵـیــشی ناکەم، ئەمە موسوڵـمانێتی و تەسلیم بوونی ڕاستەقینە نیــە بەشــەرعی خوا بەڵکو لـەخشتە چون و فریوخواردن و سەرلـێ تێك چونە ....

## چۆنیەتی تە عزیە ئەنجامدان لە ئیسلامدا

پێغەمبەری خوا ﷺسەردانی نەخۆشی ئەمر پــێ کــردووە، وەخــوای گەورە و پێغەمبەرەکــەیﷺباســی مــردن و ژیــانی بــەرزەخ و ڕۆح کێشان و گۆڕو...هتد.. یان کردووە، لێرەدا باســی ئەوانــە ناکــەین

بەڵکو تەنها باسی هەندێك لەحوکمەکانی تەعزیە گێڕان دەکەین (پرسە گێڕان) بابگەڕێینەوە و بزانین لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ تەعزیە گێڕان چۆن بووە:

١-لە قرة المزني (رضى الله عنه)دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:(پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دادەنیشت کۆمەڵێك لەهاوەڵانی لەگەڵیدا دادەنیشتن، و لەناویاندا پیاوێك هەبوو کوڕێکی بچوکی هەبوو, لەپشتیەوە دەهات و لەبەردەستی خۆیدا دای دەنیشاند, پێغەمبەری خواش ﷺ پێی ووت خۆشت دەوێت ؟

ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوندەی من ئەومنداڵەم خۆش دەوێت خوای پەروەردگار تۆی خۆش بوێت!!

ماوەیەك لەوەو دوا منداڵەکەمرد!!

ئیتر ئەو پیاوەش ئامادەی کۆڕەکانی پێغەمبەر ﷺ نەدەبوو, چونکە کوڕەکەی بەبیر دەهێنایەوە و زۆر دڵتەنگ بوو بۆی, پێغەمبەری

خواش ﷺ نەیدەبینی, بۆیە جارێکیان فەرمووی:( ئەوەچی یـە فلانـە کەس نابینم؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خـوا ﷺ منداڵەکـەی کـەدەت بینی مرد !!

دوای ئـەوە کەپێغەمبـەری خـواﷺ (پیاوەکـەی)بینـی پرسـیاری کوڕەکەی لێکرد؟!

ئـەویش(بـاوکی منداڵەکـە)پێـی ووت کـە(کوڕەکـەی)مـردووە!! پێغەمبەری خواش ﷺ سەرە خۆشی لێکرد و پاشان پێی فەرموو: ئەی فلان!! کامیانت پێخۆشتر بوو: منداڵەکەت بمایەو ژیانت پـیٚ خـۆش بکردایە, یان لەدوارِۆژدا نەچیتە بەر هـیچ دەرگایـەك لـەدەرگاکانی بەهەشت هەتاکو دەبینیـت لەپێـشتەوەیە دەڕوات و دەرگاکـەت بـۆ دەکاتەوە ؟

(پیاوەکە)وتی ئەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەڵکو پێـشم کـەوێت بـۆ دەرگاکـانی بەهەشـت و بیکاتـەوە بـۆم, بەڕاسـتی ئـەوەم

لەلاخۆشترە,(پێغەمبەری خواﷺ)فەرمووی: ئەوە بۆ تۆیە , پیاوێك لەئەنصاریەکان ووتی ئەی پێغەمبەری خواﷺ خوا بەقوربانتم بکات ئەوە تایبەتە بە ئەو ؟,یان بۆهەموومانە؟ فەرمووی بەڵکوبۆ هەمووتانە). ([1])

کەواتەموژدەبێت لەوموسڵمانانەی کەمنداڵیان دەمرێت، و ئەوانیش کرداروگوفتارێك ئەنجام نادەن کەخوای گەورەپێی ناخۆشبێت، بەڵکوسوپاس گوزار و شوکری خوادەکەن لەسەری ودەڵێن﴿إنالله وإناالله إليه راجعون ﴾!!

هەرموسڵمانێك ئەمەسیفەتی بێت لە بەرڕەزامەندی خواسوپاس گوزاربێت ئەوە(إن شاءالله) لەپێشتەوەدەبێت و دەرگاکانی بەهەشتت بۆدەکەنەوە!!

[1] أخرجه النسائي /٢٩٦/١ والسياق له وابن حبان في صحيحه ،والحاكم/٣٨٤/١ وأحمد/٣٥/٥ ،وقال الحاكم:صحيح الأسناد ووافقه الذهبي وهو كما قال.

بەلاّم سوێند بە خوا زۆرێك لەموسڵمانان لــەوكا تەنەداشــەیتانەكان لەخشتەیان دەبەن و دەكەونە كرداروگوفتــاری نابــەجێ وناشــەرعی ئەنجامدان و بەكرداری دەستی خۆیان خۆیان بێبەشدەكەن لـە خێـر و فەزڵ و بەزەییەكی زۆری خوای گەورە (پەنابەخوا)!!!

٢-لـەئوســامەی كــوڕی زەیــدەوە(رضــي الله عنــە)دەگێڕنــەوە كەفەرموویەتی (یەكێك لەكچەكانی پێغەمبــەری خــوا ﷺ نــاردی بەدوای پێغەمبەری خــوادا ﷺ كەمنــداڵێكی كــوڕ یــان كــچێك, لەڕیوایەتێكـــــدا هـــــاتووە :(أمیــــە) كــــچی(زینــــب)بــــوو، لەســەرەمەرگدایەوەرە بۆلامــان, ڕاوی(واتــە:فەرمودەگێڕوەكــە) دەڵێت:ئەویش كەسێكی نارد بۆلای كەسەلامی لێ بكات و پێـی بڵێت: ئەوەی كەبراوەتەوە هی خوایە ئەوەش كەبەخشراوە هــەر هی خوایە هەمووشتێكیش لای خوا كاتێكی دیاری كراوی هەیــە دەبائــارام بگرێــت و چــاوەڕێی پاداشــتی خوابكــات دوای ئــەوە ناردیـــەوە و فـــەرمووی پێـــی ڕابگەیـــەنن كەســـوێندی لەســـەر

خـواردووی(واتەلـەسـەرپێغەمبەری خـواﷺ کـەباوکی دەکـات) کەدەبێت ئامادەببیت, ئەوهەستا ئێمـەیش هەسـتاین, کوڕەکـەیان بـەرزکردەوە بـۆ باوەشـی پێغەمبـەرﷺ(یـان خـستیانە باوەشـی یەوە)گیانی تێك چووبوو هەناسە بڕکێی بـوو وردەوردە خـەریك بوو دەمرد, و(سعدی کـوڕی عبـادە)ش لـەناو خەڵکەکـەدابوو, (مُعاذی کوڕی جبل و أبی کوڕی کعب و وابزانم زیـدی کـوڕی ثابـت) و چـەند پیـاوێکی تـریش, لەوکاتـەدا چـاوەکانی پێغەمبەرﷺپڕبوون لەفرمێسك ,(سعد)یـش پێـی ووت ئەمەچـیە ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺخۆشـت نـەهیت کـردووە لـەگریان؟ فـەرمووی: بەڕاسـتی ئەمـە بەزەییـەکی خوایـە دەیخاتـە دڵـی هەرکەسێك کەبیەوێت لـەبەندەکانی بەڕاستی خوا بەزەی بەبەندە بەبەزەییەکانیدا دێتەوە).([٢])

[٢] أخرجه البخاري /٣-١٢٠- ١٢٢،ومسلم/٣/٣٩،وأبوداود/٢/٥٨،والنسائي/١/٢٦٣,وأبن

٣- لەئەنەسی کوڕی مالیك (رضی الله عنە)ئـەویش لـەپێغەمبـەری خواوەﷺدەگێڕێتـەوە کەفەرموویـەتی:(مـن عـزى أخـاه المـؤمن في مصبته ,کساه الله حلیة خـضراء یحبربهـا یـوم القیامـة(قیـل :یارسـول اللهﷺ، یحبر؟ قال: یغبط).([3])

واتـە:(هەرکەسـێك سـەرە خۆشـی بکـات لـەبرایـەکی بـڕواداری لەکاتێکدا توشی موسیبەتێك دەبێت ,خوای گەورە لەڕۆژی دوایـدا بەپۆشـاکێك دای دەی پۆشـێت وتـرا:ئـەی پێغەمبـەری خواﷺ(یحبر)مانای چیە ؟ فەرمووی :خەڵکی تەمـەننا و ئـاواتی پـێ دەخوازن).

حە دیسێکی تر هەیەدەڵێت:(من عزّی مصاباً فله أجره)

ماجة/١/٢٨٠ ,وأحمد/٥/٢٠٤/٢٠٦/٢٠٧والسیاق له.

[3] الأرواء/٧٥٦

واته:(هەرکەسێك سەرەخۆشی لەخاوەن بەڵایەك بكات ئەوا هەمان پاداشتی ئەوی هەیە).

ئەم حەدیسەصەحیح نیە،

ئیمامی نەوەوی لە (المجموع دا٥/٣٠٥)

ابن الحجر العسقلاني لە(التلخیص:٥/٢٥١) ڕوونیان كردۆتەوە ئەو فەرموودەیە لەهەموو ڕێگاكانیەوە ضعیف و لاوازە بڕوانە(الإرواء الغلیل/رقم ٧٥٧)

## چۆن سەرەخۆشی دەكەیت لەكەس وكاری مردوو

پێویستە سەرەخۆشی بكرێت لەكەس وكاری مردووە كە بەهەرشتێك كەبیزانیت دڵیان دەداتەوە و غەمەكەیان دەڕەوێتەوە و داوایان لێ دەكرێت كەئارام بگرن.

لەفـەرموودەی دوهەمـدا: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی:(...إن لله مـا أخـذولله مـا أعطـی وكـل شـيء عنـده بأجـل مُـسمی، فالتـصبر ولتحتسب....)

واتە:(بۆخـوای گەورەیەئـەوەی كەدەیباتـەوە وەبۆخوایـە ئەوەیـشی كەدەیبەخشێت وەهەموشتێك لای ئەوكاتێكی دیاری كـراوی هەیـە ئـارامبگرەو چـاوەڕوانی پاداشـتی خوابـە)كەئـەم شـێوازە تەعزیـە لێكردنێكی ڕاست ودروستە.

یان بڵێ:(أعظم الله أجرك و أحْسَنَ عَزاء ك,و غفر لِمَیّتكَ).

هەروەهاووتـەی تـری پێغەمبـەرﷺ كاتێـك ڕۆیـشت بـۆلای (أم سلمة)لەدوای مردنی (أبي سلمة)فەرمووی:(اللهم اغفر لأبي سـلمة,

وارفع درجته في المهديين واخلفه في عقبة في الغابرين, واغفرلنا و له يارب العالمين, وافسح له في قبره, ونورله فيه).([4])

هەروەها کاتێك کەپێغەمبەرﷺ سەرە خۆشی کرد لە(عبدالله کوڕی جعفر)لەکاتی مردنی باوکیدا پێی فەرموو:(اللهم اخلف جعفراً في أهله, و بارك لعبدالله في صفقة يمينه قالها ثلاث مرات).([5])

وەهەروەها کەسی خاوەن تەعزیەش وەسوننە تە بەوانە بلێت کەتەعزیەی لێدەکەن(جزاکم الله خيراً -أو-أعظم الله أجورنا و أجركم...)

وە پێویستەخزم و دۆست و دراوسێکان خواردن دروست بکەن بۆ ئەومالەی کە سەکەیان لێ مردووە.

---

[4] أخرجه مسلم وغيره

[5] أخررجه أحمد بسند صحيح,أنظرأحكام الجنائز للألباني/ص١٦٥

عبـــدالله كـــوڕی جعفـــر(رضـــی الله عنهمـــا)كاتێـــك جەعفـــەركوژرا پێغەمبەری خواﷺفەرمووی:(إصنعوا لآل جعفر طعاماً, فقـدْ أتـاهمْ أمرُ شغلهم أو أتاهم مايشغلهم).[٦]

واتـــــە:(خـــــواردن بـــــۆ كـــــەس و كـــــاری جعفـــــر دروســـــت بكـــەن"واتەبۆماڵـــەوەيان"چـــونكەئەوان ئـــەوەيان بەســـەردا هـــاتووە كەواسەرقاڵی كردوون).

بـــــەكـــــورتـــی:

ئەوەی پێویستە لـەسەرموسوڵمانان لـەكاتێكدا كەسێكيان لێـدەمرێت بريتی يە لـەچی:(ويلزم للميت أربعة أشياء: غسله، وتكفينهُ، والصلاةُ عليهْ، و دفنُـهُ "أجمـع المـسلمون علـى وجـوب هـذه الأمـور الأربعـة وجوباًكفائياً")

[٦] رواه أبوداود/٨/٤٠٦/٣١١٦,والترمذي/٢/٢٣٤/١٠٠٣,وابن ماجة/١/٤٩٠,وهوحديث حسن بڕوانە صحيح الجامع/١٠١٥.

پێویسته(١-بیشۆرن ٢-کفنی بکەن ٣- نوێژی لەسەر بکەن ٤- بینێژن وهەوڵبدەن بەزووترین کات قەرزەکانی بۆبدەنەوە(لەدوایدا لەگۆڕستانیش دوعای خێری بۆ بکەن )

هەرچەندە لەنوێژەکەشدا دوعایان بۆکردبێت...

**وە پێویستە لەکاتی سەرەخۆشی دا ئەم خاڵانە لەیاد نەکەین:**

١-ئامۆژگاری کەس وکاری مردوو بکرێت بەئارامگرتن و سوپاسکردنی خوای گەورە و بەهیوای پاداشتی خوابن.

٢-قسەی جوان و چاك بکەیت(کەبۆئەو مەجلیسە بگونجێت)وەك ئەوەی باسی پێغەمبەران و پیاوچاکان بکەیت کەچۆن ئارامیان گرتووە لەسەرناڕەحەتی و بەلاَ و موصیبەتەکان!!!

٣-گەورەیەتی موصیبەتی مردنی پێغەمبەریان بیر بخرێتەوە!!!

٤-وه بیریــان بخەیتــەوه پاداشــتی ئــارامگرتن چــەنده گەورەیــه لای خوای گەوره!

٥-ئەگەرماڵەکە ماڵێکی هەژار و دەســت کــورت بــوون یارمــەتی بدرێن و کەم و کورتیەکانیان بۆپڕبکرێتەوه(بەتایبەتی ئەگەر بێ باوك و هەتیوبن)..

## حوکمی لەخۆدان و شیوەن و گریان بەدەنگی بەرز

وه هەروەها دروسته کەسێك بگری لەکاتێکدا کەسێکی لێــدەمرێت بەمــەرجێك دەنــگ هەڵنــەبڕێت و هــاوار نــەکات وەهــەروەها موسوڵمانان هەرلەوێدا ئەوەی ئامادەبوو تەعزیە لەبرای موسەڵمانی دەکات و دڵنەوای دەکات ئەوەیش کەئامادەنــەبوو لەڕێگــەدا یــان لەبازاڕدا یان لەمزگەوت(واته لەکاتی نوێژەفەرزەکاندا کــەدەیبینێت یــان هــەرکاتێکی تــر) کــەبینی سەرەخۆشــی لێــدەکات وەدروســته کەخزمەکانی یان دراوسێکانی خواردن بۆ ئەو ماڵە دروســت بکــەن

کەکەسەکەیان لیٚ مردووە, وەکەس وکار و هاوەڵانی لەدووعای خێر بیٚ بەشی نەکەن باچەندینساڵیش بێت مردبێت......

وە پێویستە لەسەر هەمولایەکمان وەك موسوڵمانێکی ڕاست ڕازی بین بە قەزاوقەدەری خوای گەورە هیچ شتێك نەڵێن و ئەنجام نەدەین کەخوای گەورە پێی ناخۆش بێت و پێچەوانەی شەرعەکەی ئەوبێت.

بەڵکو هەروەك چۆن پێمان خۆشە کە خوا مندا ڵێك دە دات و شوکری خوای لەسەر دەکەین ئاوایش کەهەرکە کەسێکمان دەباتەوە سوپاسی خوابکەین کە لەسەر ئیسلام مردووە شوکری خوا بکەین کە ئەهلی خێر و چاکەبووە کە کەسێکی بیٚ دین و نوێژنەکەر و لادەر نەبووە ئەوە لەهەموو شت گەورەترە ئەوە دڵدانەوەیە بۆمان کاتێك ئافرەتێك لەناوموسوڵمانانداا دەمرێت دڵ خۆش بین بەوەی کە لەسەر دینی ئیسلام بووە و لەسەرنوێژ و ڕۆژ

و خێر و چاکە مردووە و بەردەوام بووە لەسەر فەرمان بەچاکە و ڕێگری لەخراپەکەسێکی داپۆشراو بووە(واتە لە ئافرەتان) و بەشێوازێکی شەرعی دونیای بەسەربردووە، و سوپاسی خوابکەین کەکەسێکی کافرو بێ بڕواو نوێژنەکەر و لادەر نەبووە یاخود ئافرەتێکی گوێڕایەڵی شەرعی خوابووە و ڕووتو نا پۆشتە نەبووە ....

ئەوەتە کاتێك کەئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ دەمرێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت:(تدمع العين و يحزن القلب ,و لانقول إلا مايرضي الرب, والله إنا بفراقك يا إبراهيم لمحزونون).([٧])

---

[٧] رواه أحمدفي المسند ومسلم,السلسلةالصحيحة/١٨٩٦/السراج المنيرفي ترتيب أحاديث صحيحاالجامع الصغير/ك الجنائز/١٦٢٨

واته:(چاوەکان فرمێسکیان پێدادێت, دڵ خەفەت بار دەبێــت، هــیچ قسەیەك ناڵێین ئیللا خوا لیـی ڕازی نـەبێت , سـوێند بـەخوا ئـەی ئیبراهیم بە بە جێهێشتنت خەفەتت پێ داین و نارەحەتین).

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمووی:(إنما أنـا بـشر تدمع العين و يخشع القلب و لانقول مايسخط الرب والله يـا إبـراهيم إنابك لمحزونون).(٨)

پێشەوای ئێمەیش وەك موسوڵمانان پێغەمبەری خوایە ﷺ واجبە لـە هەمووکار و بارەکانماندا چاوی لێ بکـەین و شـوێنی بکـەوین نـەك گوێڕایـەڵی هەنـدێکی بکـەین کـەپێمان خۆشـە و بـەڵام لــەکاتی تەنگانـەدا واز بهێـنین لەشــەرعەکەی خـوا و پـشت گـوێی بخـەین کەبەڕاستی ئەوەکاری موسوڵمانی ڕاستەقینە نیە!!!

---

[٨] سلسلة الصحيحة/١٧٣٢/السراج المنير:١٦٣

بۆیه بینراوه کەسێك کە مندا لێکی یان خۆشەویستێکی مردووە دڵنەواییان داوەتەوە , بەڵام ئەولەوەڵامدا گووتوویەتی خواکەسی دەست نەکەوتووە نارەحەتی بکات من نەبێت !!!!

خوایە من چیم کردبوو ئاوات لیّ کردم!!!

خوایە بۆ وام لێدەکەیت !!!!

وێنەی ئەم ووتە نابەجێیانە کەگوتراون و دەگوترێن (پەنابە خوا)

اللهم لاتؤاخذنا بمافعل السفهاء فينا.. ...

زۆرجێی داخە کەموسڵمان ئەوە ڕەفتاری بێت بەڕاستی ئەوە وتەی کەسێك نیە کە بەڕاستی لەئیسلام تیّ گەیشتبێت!!!!

بەڵکو ئەوە ووتەی ئەوکەسانەیە کەبەس لەکاتی خۆشیدا خواناسی دەکەن و ئیسلامیان دەوێت کەژیانیان یەك لەرەی تێکەوت

ئەوەشوکری خواناکەن وکوفری نیعمەتەکانی دەکەن، ودوایش دەڵێن نەمان زانی !

ئاخر زۆر نارِەحەت بوین!!

جاکە-رسول الله ﷺ -بەپێشەوای خۆت دەزانیت ئەوابزانە ئەوکاتێك کەنارِەحەت دەبوو وەك تۆی دەکرد؟؟(حاشا)

یان سوپاسی خوای دەکرد و زیاتر بەندایەتی و فەرمانی خوای بەجێ دەهێنا؟!!!!

تۆچۆن شوێن کەوتەیەکیت بۆپێغەمبەر ﷺ؟

چۆن رِووت دێت بلێیت من شوێنی ئەو کەوتووم لەکاتێکدا پێچەوانەی کردارو رِەفتاری ئەودەکەیت؟!!!

گریـانی دەنـگ بـەرز و ڕۆ ڕۆ و پۆشـاك لـەبـەرخۆدارِنین و سـەر ڕووت کـردن و لـەدەم وچـاوی خـۆدان(ئەمەهـەموی جەهالـەت ونەفامیە) لەکێوەفێربوون ؟

ئایا لەئیسلامەوەفێربوون ؟

ئایاخوای گەورەوای فەرمووە؟ و ڕێگەی پێداوە ؟

پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە؟ وای کردووە؟!

ئافرەتانی صەحابە وابوون ؟!!

بێگومان نەخێر بەڵکو ئەوکارانە شوێن کەوتنی جاهیلیە تە و شوێن کەوتنی داب و نەریتی نەفامەکانە !!!

کەواتە تۆلەوکارەتدا شوێن ئیسلام نەکەوتویت ولادەر و سەرپێـچی کاریت کردووە!!

**مـــــا نـــــــــــای چــــــیه!!**

**مەگەر دەتەوێت گشت کەس و کار و ماڵ و منداڵت هەر بمێنینەوە لەبەر خاتری جەنابت؟!**

**نەخێر چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾﴾آل عمران/١٥٨**

**پێغەمبەری خواﷺفەرموویەتی:(اثنتان في الناس هما بهم كفر:الطعـن في الأنساب، و النياحة على الميت).([٩])**

[٩] رواه أحمدفي المسند ومسلم في صحيحه،

انظرسلسلةالصحيحة/١٨٩٦ــالسراج المنير/١٦٢٨.

واته:(دوو نیشانە هەن لەناو خەڵکیدا لەکردەوەی بێ باوەڕەکانن: تانەدان لەنەسەب و ڕەچەڵەك، وەشین کردن لەسەرمردوو-گریان بەدەنگی بەرز-).

بەڵێ موسڵمانی بەڕێز ئەم کردارانە حەرام و قەدەغەکراون تانەدان لەنەسەب و بنەماڵەی یەکتری وشین و ڕۆ ڕۆکردن لەسەرمردوو کەزۆرجار موسڵمانان تێی دەکەون بەتایبەتی ئافرەتانی موسڵمان!!

هەروەها دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:(نەهی کردووە لەوەی کە کەسی صەوت بەرز بە گریان و -ڕۆ ڕۆ کردن-لەگەڵ مردودا بڕۆن).

جابزانە : ئەو دەنگ بەرزکردنەوە ، و هاوار هاوار و ، ڕۆ ڕۆ ،کردن و، پۆشاك دڕین و، سنگ کوتین، و قژ ڕنینەت پێغەمبەری خوا ﷺ بە سیفەتی بێباوەڕانی داناوە، و بەکرداری جاهیلیەت و

نـەفامی پـێش ئیـسلامی دانـاوە و فەرموویـەتی هەرکـەس وابکـات لـەئێمەنیە!!!!!

مەگەرلـەو هەڕەشەیە ناترسیت؟!!

بێگومـان ئـەوە هەڕەشـەیەکی گەورەیـە و دەبێـت هەوڵبـدەین لەوکاتانەدا ئەم فەرمودانەی پێغەمبەرمان ﷺ لـە بەرچـاوبێت و دوا ڕۆژی خۆمـان لـەدەسـت نـەدەن بـەهۆی مردنـی کەسـێکمانەوە، کەهـەمومان هـەردەبێت بمـرین ودونیـا بـەجێبهێڵین وە بـزانین ئەوناشەرعیانەی ئەنجامی دەدەین هـەموزیان بارییـە بۆخۆمـان و کـە گوناهباریش بوین ئەو کەسەی ئێمە خۆمان لـەبـەر ئـەوگوناهبارکرد ناتوانێت لـەسزای خوایی بمان پارێزێت!!

کەواتە پێویستە لەهەموکاتێکماندا پـەیڕەوی لەشـەرعی خوابکـەین وبـەئارەزوی خۆمـان دینـداری نەکـەین ، چـۆنمان ویـست بـەڵکو

کرداربکەین بەشەرعی خوا بەڵکو خوای گەورەش بەزەیی پێماندا بێتەوە و ڕەحمان پێبکات!!!!

هەروەها پایەبەرز ئیمامی ذە هە بی لەکتێبەکەیدا (الکبائر)شین ورۆ ڕۆکردنی بەتاوانی گەورە داناوە چونکە هەڕەشەی لێکراوە بەئاگر و چونە دۆزەخ !!

ئەوە تە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت:(ئەو ئافرەتانەی کە لەخۆیان دەدەن ورۆ ڕۆ دەکەن گەرپێش مردنیان تەوبەنەکەن و نەگەڕێنەوە لای خوا کەمردن جلی قورقوشم دەکرێتە بەریان و ئاگریان تێ بەر دەبێت لەدۆزەخدا).([10])

ئاگاداربن ئەی ئافرەتانی موسڵمان کردارەکە زۆر لەوە ترسناکترە کەئێوە زۆرجار گوێی پێنادەن وسەرەنجام خۆتان توشی سزای سەخت دەکەن !!

---

[10] بڕوانە:المسلم /٩٣٤/أحمد/٥-٣٤٢-٣٤٣

بەڵکوپێویستە لەسەرهەموولایەکمان کەوەسیەت بۆکەس وکارمان بکەین کەمردین شینو ڕۆ ڕۆ و ناسوپاس گوزاری خوانەکەن لەبەر ئێمە، خۆئەگەرکاری وابکەن ئەوە ئێمە لێی بەرین و پێی ڕازی نین!!

خۆئەگەر موسڵمانێك وەسیەت نەکات و وای بۆبکرێت ئەوە گوناهبار دەبێت، هەروەك ئەوکەسەی کەئەو کارە ناشەرعیە دەکات و سزادە درێت لەسەر وەسیەت نەکردنی ، بەڵام ئەگەر وەسیەتت کرد ئەوە(إن شاءالله)تاوان بارنابیت ئەگەرواش بکەن، بەڵکو خۆیان تاوان باردەبن..

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت هەرکاتێك کەسێکتان لێ مرد وموصیبەتێکیان بەسەرهات بڵێن:(اللهم آجرني في مصيبتى واخلفني خيراً منها...)

واتە:(خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەم نارەحەتیە و چاکترم لەوە بۆ بەجێبهێڵە-یان" چاکتر لەوەم بۆبخە جێی"-ئیللا خوای گەورە

پاداشتی دەداتەوە لەسەر ئەوەی کەتوشی بوە و چاکتر لەوەی پێ دەبەخشێت.[11]

**پێویستە لەسەر کەس وکار و خزم ونزیکانی مردوو ئاگاداری ئەم ئادابانە بن و پەیڕەوی لێبکەن**

١-زۆر سوپاس و ستایشی خوای گەورە بکەن و داوای پاداشتی خوا بکەن.

٢-خۆتان بڕازێننە وە بەئارامگرتنێکی جوان وە پێویستە ئەوەیشتان پێوە دیاربێت.

٣-زۆر داوای لێخۆش بوون لەخوای گەورە بکەن بۆکەسی مردوو.

---

[11] رواه المسلم

٤-ئاگاداری خەڵکی بکەن و(تەکلیف بکەن)تاوەکو گەردنی ئازاد بکەن.

٥-ئەگەر قەرزارە بەزوترین کات قەرزەکەی بۆبدەنەوە بەخاوەنماڵ.

٦-خۆتان بپارێزن لەبەخشینەوەی شتی حەرام بەسەرخەڵکیدا لەکاتی سەردانی کردنی خەڵکی بۆلاتان وەك شیرینی و جگەرە(لەهەموکاتێك ولەکاتی تەعزیەشدا بەتایبەتی تر)...

٧-واز بهێنن لەگاڵتە و گەپ و باسکردنی دونیا( لەگۆڕستان)چونکە گۆڕستان شوێنی بیرکردنەوەیە لەمردن نەك شوێنی پێکەنین و گاڵتە کردن!!!

٨-ئەگەر ڕۆژو قەرزدارە بۆی بگرنەوە، یاخود حەجی بۆبکەن، وەچاك بن لەگەڵ هاوەڵەکانیدا...

## پاداشتی خوای گەورە بۆئەوانەی ئارام دەگرن

## لەسەرموصیبەتی مردن کاتێک ڕویان تێدەکات

ئەگەر کەسێك لەئێمە توشی موصیبەتی مردن هات وکەسێکی مردو ئارامی گرت و بەصەبر بوو ئارامی گرت شوکرو سوپاسی خوای کردوو گوێڕایەڵی شەرعی خوا بوو کارێکی نەکرد کەخواو پێغەمبەر ﷺ پێی ڕازی نەبن ، ئەم جۆرەکەسانە پاداشتەگەورەکە وەردەگرن(إن شاءالله) وەئەمانە بەڕاستی شوێن کەوتووی ئیسلامن لەخۆشی و ناخۆشیدا بیری خواو پێغەمبەریان هەیە ﷺ ئەمانە ڕاستگۆیان و براوەکانن کە لەبەر مردنی کەسێکیان -کەهەمووومان هەردەبێت بمرین-ناشوکریان نەکرد و کوفریان نەکرد و گلەییان لەخوانە کرد و بەفەزڵی خوارێگەیان نەدا شەیتان زاڵبێت بەسەریاندا بەڵکو بەسەرشەیتان و نەفسیاندا زاڵبون و سەرکەوتن!!!

خوای گەورە دەفـەرموویّت:﴿ وَلَنَبْلُـوَنَّكُمْ بِـشَيْءٍ مِـنَ الْخَـوْفِ وَالْجُـوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الْـأَمْوَالِ وَالْـأَنْفُسِ وَالثَّمَـرَاتِ وَبَـشِّرِ الـصَّابِرِينَ۝الَّـذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾[12]

واتە:(بێگومان بن هەنـدێك جـار تاقیتـان دەكەینــەوە بەشـتێك لــەترس و برسیەتی و كەمكردنەوەو لـەناو چوونی ماڵ و دارایی دونیاو زیانی گیـانی و تیاچـوونی بـەرووبوم و دەســكەوتەكانتان , بـەڵام دەبـێ ئـارامبگرن وەساتۆش ئـەی محمـد ﷺ بەوانـە كـەخۆڕاگر و بـەئارامن مـژدە بـدە , ئەوانەی كەتوشی هەر بەلاّ و نەهامەتی یەك دەبـن دەسـت بـەجێ دەڵـێن ئێمە هەرهی خواین و ئەودروستی كـردووین و دەرئـەنجامیش لـەقیامەتـدا هەربۆلای ئەو دەچینەوە).

ئەوانەی كەئاوا دەڵێن وناشەرعی ئەنجام نادەن وخۆیـان دەپـارێزن چـیيان بۆهەیە لای خوا ؟

[12] سورة البقرة/١٥٥_١٥٦

خوای گەورە هەر لــەدوای ئــەو ئایەتــەدا دەفــەرموێت:( أُولَئِـكَ عَلَـيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُون),([13])

واتە:(مژدەیان بدەرێ " ئەوانەی کەئەوە سیفەتیان بێت" دەکەونە بــەردور و دو ڕەحمەتی پەروەردگاری خۆیان و شارەزاو ڕێنوێنی کراو هەرئەوانــەن ).

ئەوەیە پاداشتت:

١-دەکەونەبەر ڕەحمەتی خوا .

٢-هەرئەوانەش هیدایەت دراون !!!

بۆچی ئەوپاداشتە گەورەیە لەدەست دەدەیت لەکاتێکــدا هــەردەبوو ئــەو کەسە بمردایە خۆبەوەی کەووتت یان ئەنجامتدا لەناشەرعی جگە لە تاوان

[13] سورةالبقرة/١٥٧

و پەشیمانی شتێکی ترت دەست نەکەوت مردووەکەش بەوە زیندوو نەبویەوە!!!!

جا لەپێشدا ئارام بگرە تا لەدوایدا پەشیمان نەبیت!!!

## ئایا ئەوتەعزیە دانانەی ئەمڕۆ موسڵمانان ئەنجامی دەدەن تاچەندە شەرعییە ؟

ئەوەی کەدەبینرێت شتێکی ئاشکرایە بەتایبەت –لەکوردەواریدا– کە کەسێك دەمرێت سێ(٣)ڕۆژ تەعزیەیە و لەمزگەوت پیاوان دادەنیشن و خەڵکی دێت و دەڕوات لەشوێنی دوورە وە بەرێدەکەون تافریای تەعزیەکەی بکەون تاسێ(٣)ڕۆژەکە تەواو نەبووە !!

وەپیاوان و ئافرەتانیش لەخێمەدا کۆڵانێك دەگرن و کۆدەبنەوە(کەئەمکارەش بۆتەهۆی ئازاردانی ئەوموسڵمانانەی کەشۆفێرن وسەیارەیان پێیە)!!

قورئـان خـوێن بـانگ دەکرێـت هـەم لەمزگـەوت هـەم لـەناو خێمـە هەریەکـەیان پارەیـەکی باشـیان دەوێـت وقورئـان فرۆشـی دەکـەن وموسڵمانان فریودەدەن(کەکارێکی نادروستە)!!

ئینجا چەند ڕۆژێك ماڵی ئەو کەسەی کەکەسەکەیان لـیٚ مـردووە(جگـە لەوەش کەکارەکەیان ناشەرعی یـی وتەعزیـە دائـەنێن) دەبێـت خـواردن بدەنە خەڵك وەك چێشتخانە و چایخانە !!!!

خەڵکیش فێربووە دەبێت خواردنی دەرەجەیـەکی پێبـدەیت-وەك خۆیـان دەڵێن-ئەویش چۆن:

برنجەکەی کوردی بێت، یان برنجێکـی بـاش بێـت، پڕبێـت لـەکشمیش، فاصۆلیا دەنکەکانی کشابێت، گۆشتی حەیوان ببێت، نانەوا-نانی بـازاڕی چونکە خەڵکێك بەنانی کوردی ڕازینین-، و چایی بۆنداروخۆش و ئـاوی سەفەری .....

وەچـەندین زەحمـەت و نارەحـەتی دەخرێتـە سـەرماڵی کـابرای کـەس مـردوو(ئێـستە لـەهەنـدێك شـوێن ئـەوەیش زیـادی کـردووە کەشـیرینی دەبەخشنەوە لـە تەعزیەدا بە جۆرێك نازانیت ئایا ئەمە"ئاهـەنگی زەواجـە یان تەعزیەیە"-مەگەر بەلافتەکەدا بزانیت!!

ئایائیسلام کار سوك دەکات یان قورسی دەکـات ؟ (هەرچـەندە زۆرجـار کابرای خاوەن تەعزییە شایستەی ئەوهـەموو بارگرانیەیـە کەبخرێتەسـەری لـەبەرئـەوەی کاتێـك کـەپێی دەگوترێـت تەعزییـە بەوشـێوازە بیدعـە و داهێنـراوە و ناشـەرعییە ئـەوە دەچـێت بەگـژ ئەوکەسـەدا کەئـەو ئامۆژگارییەی دەکات ، یان دەڵێت چیبکەم عادەتە ئەگەرنەچـی گلـەیت لێدەکەن ...،

بەڵام کاتێك بۆخۆی کەسێکی لێمرد ئینجا دان بەوە دا دەنێت کەتەعزییە شتێکی خراپە، لـەبەرئەوەی پارەی بەدەستەوە نـەماو خـەڵکی هەراسـانی کردووە!!

بۆیه بزانه ڕاست ئەوەبوو لەپێشدا باسمان کرد کەشەرعیه خواردن دروست بکرێت بۆماڵی مردووەکه نەك بەپێچەوانەوه کەسوکاری مردوو خواردن دروست بکەن بۆخەڵکی!!!

چاك بزانین وجوان تێبگەین -هیچ پێوست بەوه ناکات نارِەحەت ببین و بیانو بهێنینەوه وبەوەی کەبڵێین ئاخروایه و کۆمەڵایەتییه و گلەیمان لێدەکرێت و ناکرێت خۆمان لەخەڵکی جیابکەینەوه و ئەوەنیه فلانه مامۆستاش وادەکات یان دەچێت بۆتەعزیه..و..و(ئەم جۆرەبیانووه نەزۆکانه هیچ سودی نییه)!!

بۆیه دەڵێم: بەهیچ شێوەیەك ئەو کارانه"تەعزییەگێڕان" شەرعی و دروست نین وهیچ دەقێکی شەرعی پشتگری نیه ولەهیچ شوێنکی شەرعدا جێی نابێتەوه!!! بەڵکو ناشەرعی و قەدەغەو داهێنراوه!!

کیٚ دەتوانیٚت یەك بەڵگە بهێنیٚت لەقورئانەکەی خواو لەفـەرموودەکانی پیٚغەمبەرو ﷺ وتەی هاوەڵاٚن(رضي الله عنهم)کەئەوان وایان کردبیٚـت و تەعزیەیان دانابیٚت؟؟!!!

بەڵکوهیچ بەڵگەی لەسـەرنیە و دەبیٚـت هـەتاوەکو دەمـرن سـەربنیٚنەوە بەوخەفەتەوە یان بگەڕیٚن بەدوای بەڵگەداو هەرگیزیش دەستیان ناکەویٚت مەگەر ورێنە بکەن بەناوی ئیسلامەوە!!!

ئەوە هاوەڵاٚن وەفاتیان دەکـرد وشـەهید دەبـوون...نـەبینراوە یـەکیٚکیان تەعزیەی بگیٚرِیٚت!!

لەشەڕی ئوحود دا(٧٠)صەحابە شەهیدبوون جادەبوایە (٧٠)سـیٚ رِۆژی دابنیشتنایە بۆتەعزیەگیٚرِان و(٧٠)خیٚمەیان دابنایە لەکۆلاٚنەکانـدا !!! ئایـا وایان کرد؟؟!! بیٚگومان نەخیٚر ....

بۆیە دەڵیٚم ئەوکارانە شەرعی نیە دەبینیت لەو تەعزیٚیانەدا قورئان فرۆشتن وشعرگوتن و مطعم دانان و چـای گیٚـرِان و شـین و رِۆ رِۆ و قـەرەباڵغی

کردن وتێکەڵبونی پیاوان وئافرەتان بەیەکتری و خەڵك نارەحەت کردن و خێمەدانان(کۆڵاَن گرتن لەخەڵکی پێی)و ئافرەتان دانیشن زەم وزەم گاری وحیکایەتی تێداباس بکەن وچەندین ناشەرعی تر ڕودەدەن!!

ئەمەچی یە؟؟!!

(تەعزییە یە)!!

ئەمە لەکوێی شەرعدا جێ دەکەیتەوە؟؟....

ئەگەر بەڕاستی موسوڵمانین وباوەڕدارین پێویستە وازلەو کارە"تەعزیەگێڕان"بهێنین ولە لۆمەی لۆمەکار نەترسین بەڵکو لەخوابترسین و گوێڕایەڵی شەرعەکەی خوابین ئەوانەی گلەیت لێدەکەن تەنها نەزان و چلێسەکانن و فریات ناکەون لەقیامەتدا !! باهەربلێن باوکی خۆش نەویست دایکی خۆش نەویست ڕقی لەبراکەی بو.........(ئەوجۆرە قسانە قسەی ئیفلاسی ئەوجۆرە کەسانەیەکە هیچ بەڵگەیان پێنیە بۆیە لەئەنجامی نەزانیەکەیان وڕێنە دەکەن وفەلسەفە

لێدەدەن)ئێمەش پێیان دەڵێین :ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وفاتی دەکردیان کاتێك ئیبراهیمی کوڕی وەفاتیکرد یان هاوەڵانی شەهید دەبون تەعزیەی بۆ دانەدەنان ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی خۆشنەدەویست ورقی لێیان بوو!!!؟؟

ئەگەربڵێن بەڵێ ڕقی لەوانەبووە ئەوە درۆ دەکەن!!

(كَلِمَةً تَخرُوجُ مِنْ أفواهِهِم إن يَقُولُونَ إلاكَذِباً)!!

وەلامی تریشی بەجێدەهێڵم بۆتۆی ژیر(........................)

خۆ ئەگەر بڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان لەبەرشەڕ و جیهاد پێیان نەکراوە تەعزیە بگێڕن و مەشغوڵ بوون!!

## پێیان دەڵێین:

١-پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەردەوام لەجەنگ وجیهاددا نەبوون!!

٢-ئایا پێیان دەکرابــچن بۆجیهــادو چــەندین ڕۆژبمێننــەوە بۆجیهــادکردن وئاینی ئیسلام بگەیەننە چەندین ولاّتی دوور مەجالی ئەمانەیان هەبوو بەلاّم مەجالیان نەبوو دوو ڕۆژ(دوو عەسر دوو دوای نیوەڕۆ دوو شەو)دابنیشن بۆتەعزیەگێڕان؟!!

بۆیە دەڵێم هەموئەوانەی دەیانەوێت بنەبڕی ئەم کردارە ناشەرعییە بکــەن ئەگەر تۆ بتەوێت کردارێکی جاهیلیەت لەناوبەیت دەبێت گوێ بەو وتە پوچانە نەدەیت کەوتەی موفلیس و بیانوگرەکانە!!

کێش حەزی لــەمطعــم وچایخانەیە ئەوەبازاڕ(نەك بەناوی تەعزیە گێڕانــەوە دابنیشێت بۆنان وچایی خواردن)...

کێش شەرعی خوای دەوێت ئەوەشەرعی خوا(کەتەعزیــە گێــڕان لــەهیچ شوێنێکیدا جێی نابێتەوە) .....

دەگێڕنەوە لە ساڵی (حەفتاکان وهەشتاکان)دا تەعزیە گێــڕان ("١"یــەك) مانگ بووە !!! ئێستا بووە بە دوو ڕۆژ و سێ ڕۆژ !!

ئەوەبەڵگەیە لە سەر ناشەرعیە تەکەی کە ئەگەرخێروعیبادەت بوایە خوای گەورە باسی دەکرد و دیاری دەکرد ئەگەردیاری کراو بوایە بۆچی دەتوانرێت بگۆڕدرێت و لێی زیادوو کەم بکرێت ، دەبینت ئەم کارە لێی زیادوکەم دەکرێت بەئارەزوی کەسی تەعزیە گێڕ لە یەك مانگ کەمکراوەتەوە بۆ بۆ(بیست) ڕۆژو(پانزە) ڕۆژو (دە)ڕۆژ و (سێ) ڕۆژ و دووڕۆژ....؟؟!!

بەڵام دەبینین کە عیبادەت و پەرستشەکان لەئیسلامدا کەس بۆی نیە لێی زیادو کەم بکات ، ئەوەحەج و ئەوەڕۆژو و مانگەکانیان وە کاتەکانیان دیاری کراوە کێ دەتوانێت حەج بباتە مانگێکی تر؟!!

یاخود غەیری مانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبێت(وەبیشڵێت ئەمە ڕەمەزانە) یاخود بیخاتە مانگی شەعبان ، یان مانگێی تر، یاخود پێنج فەرزە نوێژەکە بکات بە چوار یان کەمتریان زیاتر ؟! کاری بەوشێوازە بەکەس ناکرێت ، چونکە عیبادەتێکی دیاری کراوە ، بەڵام تەعزیەگێڕان خەڵکی چۆن

بیەوێت وادەكات ، چونكە بەدەست خۆیانەو شـەرعی خوانیـە ئەگەرلـە شەرعدا بوایە نەدەگۆڕا و نەدەتوانرا دەستكاری بكرێت !!!

بۆیـــە جـــارێكی تـــردەڵێم: ئـــەم تەعزیـــە گێـــڕان و ئـــەرك خـــستنە سەرموسـوڵمانانە(بـەناوی تەعزیـەوە) لــە هـیچ بـابێكی شـەرعیدا جێـی نابێتەوە!! بزانە (سێ) ڕۆژ یان (یـەك هەفتـە) چـی مەسـروفێكی دەوێـت (بەتایبەتی لـــەم ڕۆژگـارە شـدا كـەزۆرێك لەشـتەكان گـرانن بەتایبـەتی بۆكەسێكی هەژار یاخود كەسێكی ناوەندی) بـرنج و بابەتـەكانی و شـلـە دروست كردن و گۆشت و نان و ئاوی سەفەری و......هتد)كە بێگومان تەعزییەی واهـەبووە (پێـنج ملیـۆن ودەملیـۆن یـاخود زیـاتر وكـەمتری تێـچووە)!! بەڵكوزۆركەسـی هــەژار كـەتواناى نییـە كەوتوەتـە ژێـر قەرزداریەوە ، لەبەر مەسرەفكردنی بێسود لە تەعزیەگێڕاندا.

كەلەم ڕۆژگارەدا تەعزیە گێڕانێك كەمترین مـاڵی تێـدا سـەرف بكـەیت وەك دەگوترێت:(هیچی نەوێت و زۆرسادەبێت) چەند ملوێنێكی دەوێـت

(خۆئەگـەر کەسـێك دەوڵەمەنـد یـش بێـت هەرشـەرعی نیـە تەعزیـە دابنێت)!!!

ئەمە بەچی شەرعێك ڕەوایە !!

ئەمە تالآنی کردنە؟ یاخود مطعم دانانە ؟ یاخودچـایخانە یـە ؟ یـاخود چـی یە؟!!

لەگەڵ ئەو هەموو ماندوبون و ئەرك و مەسرەفەشدا لەوانەیە گلـەیـشیان لـێ بکرێـت-وبکەونـە غەیبـەت کـردن وقـسەگوتن بـەکابرای تەعزیەگێڕیش(وەك گوتراویشەو بەردەوامیش دەگوترێت)-وەك دەڵێن :

برنجەکە بەوشێوازە بوو !

بۆچی شلەکەگۆشتی تیانەبوو؟ بۆچی دۆشاوەکەی کەم بوو؟!

گۆشتەکەی نەکولآبوو!!

به چەند ئافرەت برنجەکەیان لێنابوو؟؟ ببوە تۆپەڵ !! ئەی لەشیان ساغ نەبێت!!!

کشمیشیشی تێدا نەبوو !!

چاییەکە بۆن خۆش نەبوو!! بێ ڕەنگ بووهەردەڵێی چای (ئێرانی) بوو!!
دیارە دڵیان نەهاتووە چای تێبکەن!!

یان دەڵێن: ئەوەندەکوڵابوو ببو بە دۆشاو !!!

چونکە لەڕاستیدا ئەوانە بۆرپیایی یان چڵێسی هاتوون ، نەك لەبەرخوا(خۆئەگەر بلێن لە بەرخواچوین ئەوەهەرکارەکەیان نابێتە شەرعی چونکە کارێکی داهێنراوە وپێچەوانەی سونەتەو قەدەغەیە لەشەرعدا)......!!!

چەندین قسەی ناشرین کە دەبیسرێنەوە کەگوتراون، کەهەموی غەیبەت وناشەرعییە, دەی خۆکاتێك تۆچویت ئەوە(یەکەم): ناشەرعیت ئەنجامداوە.

(دووەم): خۆپارەت نەداوە ئاواگلەیش دەکەیت !!

ئینجا بزانە خێمەی ئافرەتان(کەبیدعە و ناشەرعیەکی ناشرینی تری داهێنراوە): زۆربەداخەوە پڕیەتی لەزەم وغەیبەتکردن!!

ئەوەفلانەکەس کوڕەکەی چۆتە خاریج ؟؟

ئەوەفلانەکەس چەند کچی هەیە ؟؟ چەندی ماوە ؟؟ چەندی شوی کردوە؟؟

ئەوەفلان معاشەکەی چەندە؟ چی لێدەکات؟ئەی بۆهەردەڵێت بەشمان ناکات؟

ئـەوە بۆتەعزیەکـەی سـاردە ؟کـەس بـۆی نـاگری و لـەخۆی نـادات!!
بەخوا دیارە پێیـان خۆشـەکە مـردووە -ئـەگینا لەسـەر ئەوەنـدە کـچدا
هەردەبوو یەکێکیان بگریایەو لەخۆی بدایە-؟؟!!

ئەوەکوڕی فلانەکەس ژنی هێنا چەندی ئاڵتون پیٚ کـرد ؟ ئـەی بـەمیراتی
کەویٚ جاخۆی بایی ئەوەندە دەبێت؟!!

ئەوکراسەت بەچەندکڕی براژن پورە فلاَن بـەخوا (ماشـاءالله) جوانـە !!
ئەوەهەردەڵێم دەی کڕم بەلاَم خۆ مەعاشەکە بەزیاد نـەبێت بەشـی هـیچ
ناکات!!

ئەوەفلاَن کـەس ئـەوە بـاوك و براکانـت ئێـستە بـە چـیەوە خـەریکن و
مەشغوڵی چین!!؟

(ئافرەتێك دەڵێت)ئەی باجی فلاَن و دادە فلاَن بۆنـەهاتوون ؟!!(یـەکێکی
تریان دەڵێت)کوڕەئەوە هەروا ساردن لەخزمایـەتی دا!!(کـەس وکـار ی

مردوو یاخود نزیکەکانی مردوو دەڵێن)دەی بەخوا کچیێ مادام نـەهاتووە باوکیشی بمرێت ناچم بۆلای !!!

ئەمانە هەمووی بیستراون و بەزیادەوە نەك کـەمتر لـەمانـە —جاائافرەتەکـە دەچـێتەوە مـاڵ دەڵـێ پیاوەکـە چـوومە تەعزیـە: ئـەی کـەوابوو (جـا تەعزیەکەی ساردبوویێت(شین ورِۆ رِۆوی تێدا نە بوبێت) باسـی دەکـات گەرم بووبێت(شین ورِۆ رِۆی تێدابوبێت) باسی دەکات !!

کـورِە پیاوەکـە دەزانیـت فلانەکـەس شـوی کردۆتـەوە(دەك بـەمیراتی کەوێت)!!؟

بەخوا فلانە ئافرەتی لیێ بوو وا قەڵەو بۆتەوە هەرنە بێتەوە!!

فلان ئافرەت وازەعیف بووە هەردەڵێی نـانی نـادەنیێ!!(بەڵکوئـەم قـسانە غەیبەتن) ئیتر وەسفی هەموو ئافرەتەکان کە بینیویـەتی بۆپیاوەکـەی بـاس دەکات کەئەوەیش کارێکی حەرام و نادروستە!!!

ئەمە کێ بووە هۆی ئەم هەموو قسەو غەیبەت و کارە ناشەرعیانە؟

بێگومان هۆکارکەسی خاوەن تەعزیە و تەعزیە دانەر!!!

وە دەبینیت زۆربەی ئافرەتان بە پۆشـاکی ناشـەرعیەوە دەچـنە تەعزیـە ، یاخود دەڵێ بابچین گلەیمان لێنەکات –پیاوانیش هەروەها–دەڵـێن جلـی جوان لەبەربکە خـۆ ئەگەرجلـەکانی جـوان نـەبێت دەڵـێن مەیـە کاکـە حەیامان دەبەیت عەیبە!! ئینجـا خـۆی پیـشان خـاوەن تەعزیـە دەدات و دێتەوە تاوەکوئیتر پێی بڵێن هاتووە و لێرەبووە !!!!

باشە ئەمەڕیای و لە بەرخەڵك چوونە یاخود لەبەر خوایە ؟؟

ئەوەلای کەسی ژیر دیارە و ئاشکرایە ( پـەنـابـەخـوا)!!!!

وەهەروەها پێویستە ئەوەش لەبیرنەکەین کەلەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەهۆی ئەوەی موسڵمانان دەچن بۆتەعزیـە گێـڕان لەشـوێنە دورەکـان زۆرجـار لەڕێگادا کارەساتی دڵ تەزێن ڕویداوە وەك وەرگەڕانی سەیارە، یان دەعم

وپێکدادانی سەیارە و سەرەنجام چەندین کەسی ترپێی مردووە و لەناو چووە!! ئەمە هۆکارەکەی چی بوو؟؟ چون بۆتەعزیەگێڕان!!

یاخود لەهەندێك لەوناوچانەی کەکێشەو ئاژاوەی تێدایە لەم ولاّتەی خۆماندا (عێراق) وەك شارەکانی:( کەرکوك خانەقین و دوز و....) چەندین شاری تر کەکەسێك تەعزیەی گێڕاوە بەهۆی مردنی کەسێکیەوە لەکاتی کۆبونەوەکەیاندا بۆپرسە گێڕان لەلایەن کەسانێکی دوژمنی ئاین و خاك و خەڵکی یەوە هەستاون بەوەی تەقینەوەیەك ئەنجام بدەن لەناویاندا وبوەتەهۆی کوشتنی دەیان و سەدان کەسی تر ئایا ئەمە زیان بەخۆگەیاندن نیە ئەمەش بەشێکی ترە لە زیانەکانی تەعزیەو پرسە گێڕان کەپێویستە خۆمانی لێبپارێزین!!

---

**حوکمی نانکردن بۆتەعزیە و خواردنی نانی تەعزیە.**

---

لەکۆتایـدا ئامـاژە بەهەنـدێك لـەووتـەی پێـشەوایان دەکـەین سـەبارەت بەحوکمی تەعزیەدانان دانیشتن لـەشوێنێکی تایبەتیدا بۆتەعزیەگێڕان و نان دروست کردن بۆ تەعزیەگێڕان:

١_جریربن عبدالله البجلي(رضی الله عنه)دەفەرمووێت:(کُنا نعـدالإجتماع إلى أهل الميت,وصنيعةُ الطعام بعد دَفْنهِ مِنَ النياحة),([14])

واتە:(ئێمەکۆبونەوە لـەلای کـەس وکـاری مـردوو "تەعزیـە"ودروست کردنی خواردن پـاش ناشـتنی مـردوو هـەردووکیمان بەشـیوەن دادەنـا- مەبەستی ئەوەیە وەکو شیوەن بەحەرامان دەزانی-).

٢_ئیمامی نەوەوی(رحمهالله) دەفەرمووێت:(وەدانیشتن بۆ -تەعزیە-شافعی ومُـصنف-دانـەری -مُهـذب- وەکـەمجموع ی لەشـەرحیدا دانـاوە - وەهاوەڵان -ڕەزای خوایان لێبێـت-واتـە:هـاوەڵانی شـافعی -نـص یـان

---

[14] رواه ابن ماجة/٤/٥١٤/١٦١٢, وأحمد/٦٩٠٥, وصححه النووي في المجموع/٥/٣٢٠, وصححه الألباني في صحيح ابن ماجه/١٣٠٨.

پێداوەکە(مکروە)ەفەرموویانە: مەبەست بەدانیشتن ئەوەیە کەس وکاری مردووەکە لە شوێنێکدا دانیشن وە ئەوانەیشی دەیانەوێت سەرەخۆشیان لیّ بکەن و ڕووبکەنە ئەوشوێنە , فەرموویانە بەڵکو دەبێت هەرکەسێك پێیان گەیشت سەرەخۆشیان لیّ دەکات وەجیاوازی نییە لەنێوان پیاو ئافرەتدا لە-کراهە-ی دانیشتن دا).([15])

ئەوکەراهەتەش حەرامەلەووتەی پێشیناندا -وەمادام سەربۆ حەرام دەکێشێت وناشەرعی وئیسرافی تێدا ئەنجام دەدرێت، ئەوەکارێکی ناشەرعی و حەرامە -.

زۆر جار خاوەن تەعزیە بەهۆی قەرەباڵغی لە ماڵەکەیدا ناتوانێت بێت بۆ نوێژی جەماعەت، هەندێك جار بەوهۆیەوە(١٠دە)ڕۆژ نەچووەتە مزگەوت بۆنوێژکردن کە(٥٠پەنجا فەرزدەکات)...!!!

---

[15] المجموع/٥/٣٠٦

یاخود جومعەی فەوتاوە چونکە میوانەکەی نوێژنەکەر بووە ئەمیش ڕووی ناهاتووە بەجێی بهێڵێ و جومعەکەی لەدەست خۆیداوە(دەبولەمردنی کەسەکانمان سودوەربگرین وزیاترپەرستش ئەنجام بدەین نەك وازلە نوێژبهێنین چونکە کەسێکمان وەفاتی کردووە)!!!

وەهەروەها لەمزگەوتدا دەبینی بەهۆی ئەو تەعزیە یەوە کەسانێك ڕوو لەمزگەوت دەکەن کەدروست نیە بچنە مزگەوتەوە وەك کەسانی (بێباوەڕ, لەش گران, عارەق خۆرلەکاتی سەرخۆشیدا......هتد)

تۆش هەر دەبێت لەبەر هەموولایەك هەڵبستی و پێیان بڵێی بەخێربێن سەرچاوم....هەیە کوفردەکات هەردەبێت بڵێیت سەر چاوم !!

موشریکە هەرسەرچاوم !!

زاڵمە هەر سەرچاوم !!

جنێو بە سوننەت دەدات هەرسەرچاوم....!!!.

جنێو بەخوا و پێغەمبەر ﷺ دەدات هەربەخێربێت !!!

جنێوبەهاوەڵان دەدات هەر بەخێربێت ودەبێت لـەبەری هەستیت !!!

ئیمانی بە ئیسلام نیە لـەبەر عەیبە هاتووە هەرسەرچاوم !!!

نوێژدەکات هەرسەر چاوم پیاوی چاکەئەهلی خێرو تەقوایە هەرسەر چاوم !!!....

دەی چی جیاوازیەکت کـرد لــەنێوان خراپـەکاران و چـاکە کارانـدا ؟؟ (...هــــــیـــــچ ...)

کەواتە بوویتە هۆکاری ئەوەی چاك و خراپ یەکسان بکەیت-پەنا بەخوا -خوای گەورەدەفەرموویت:﴿أفنجعل المسلمين كـالمجرمين مـالكم كيـف تحكُمُون﴾!!

﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَـيْكُمْ يَـا بَنِـي آدَمَ أَنْ لَـا تَعْبُـدُوا الـشَّيْطَانَ إِنَّـهُ لَكُـمْ عَـدُوٌّ مُبِين﴾يس / ٦٠

٣_ئیمامی شافعی(رحمهالله) لـهکتێبی(الأم)دا دەفـەرموویت:(وأكـرهُ المـأتم ,وهي الجماعة وإن لم يكن لهم بُكاء,فَإنَّ ذَلك ذَلك يُجـددُ الحُـزْنَ ويُكلَـفُ المُؤنَة مع مامضى فِيهْ مِن الأثرِ).([16])

واته:(مآتم- بەباش نازانم، ئەویش ئـەو کۆبوونەوەیەکـە بۆکـەس وکـاری مردوو دەکرێت، تاخەڵکی سەرەخۆشیان لێبکات , باگریانیشی لەگەڵـدا نەبێت، چونکه ئـەوەدڵ تەنگیەکـە تازەدەکاتـەوە و ئـەرکیش لەسـەریان دروست دەکات لـەگەڵ ئەو ئەثه رانەی پێشویش کەلـەبارەیەوە هـاتووە- کەکارێکی خراپە-).

٤_قـال النـووي(رحمـه الله) في الروضـة(٢/١٤٤)(التعزيـة سـنةٌ, ويكـرهُ الجلوسُ لها).

واته:(پرسەوسەرەخۆشی کردن سونەتە-واته کەسەرەخۆشـی ودڵنـەوای بکەیت- بەڵام دانیشتن بۆی لـەشوێنی تایبەتیدا مەکرە وخراپە)

---

[16] كتاب الأم/١/٢٤٨

٥_قال أبوا الخطاب(رحمه الله):(يُكره الجلوس للتعزية).([١٧])

واته:(باش نيه وخراپه دانيشتن بۆ تەعزييه گێڕان)

٦_قال الإمام ابن القيم(رحمه الله):(وكان هديه ﷺتعزيـة أهـل الميت ,ولم يكن من هديه أن يجتمع للعزاء ولا يقرأ له القـرآن , ولاعنـدقبره ولاغـيره, وكل هذابدعة حادثة مكروهة).([١٨])

واته:(لەهيدايەتەكانی پێغەمبەرﷺبۆئێمە ئەوەيە كەسەرەخۆشی ودڵنەوای لەكـەس وكـاری تەعزيـە بكـەين، بـەڵام لەهيدايـەت وڕێ وشـوێنی پێغەمبەرﷺنەبووەكەكۆبوبنەوە بۆتەعزيەگێڕان، وەقورئانيان نەخوێنـدووە بەوبۆنەيـەوە وە نـەلای گۆڕوجگـە لـە وێيـشدا نـەيان خوێنـدووە، هەمووئەوكارانە زيادكراوەوداهێنراوەوباش نيەوخراپە)

---

[١٧] المغني /٤٨٧/٣/

[١٨] زاد المعاد/٥٢٧/١/

٧_قال أحمد(رحمه الله) في رواية أبي داود(رحمه الله):(وما يعجبني أن يقعدُ أولياء الميت في المسجد يُعزّوْنَ, أخشى أن يكون تعظيماً للميت).

واته ئيمام ئهحمهد(رحمهالله) دهفهرموێت:(پێم خۆش نیه و بهباشی نازانم كهس وكاری مردوو لهمزگهوت دابنیشن، و خهڵكی لهوێدا تهعزیه یان لێبكهن، ئهترسم ببێته هۆی بهگهورهدانانی مردووهكه)

٨_وقال في –الروض المُربع شرح زاد المُستقنع– للإمام البُهُوتي(رحمه الله) :(ويكره لهم –أي لأهل الميت –فعله–أي :فعل الطعام –للناس–...).([19])

واته:(مهكروهه بۆكهس وكاری مردووكهخواردن بۆخهڵكی دروست بكهن)

٩_وقال في حاشية –إعانة الطالبين–:(......ويحرم تهيئته للنائحات لأنه إعانة على معصية وما اعتيد من أهل الميت طعاماً ليدعوا الناس اليه بدعة

---

[19] الروض المربع شرح زاد المستقنع/ص١٨٦/ك–الجنائز

مكروهة -كإجابتهم لذلك .....ومن ثم كره اجتماع أهل الميت ليقصدوا بالعزاء, وفي حاشية العلامة الجمل على شرح المنهج: ومن البدع المنكرة والمكروه فعلها: مايفعله الناس من الوحشة والجمع والأربعين , بل كل ذلك حرام إن كان من مال محجور , أومن ميت عليه دين أويترتب عليه صفررأونحو ذلك ..... ويكره الضيافةمن الطعام من أهل الميت لأنه شرع في السرور وهي بدعة...).([20])

واته:(...خواردن دروست كردنی كەس وكاری مردوو تاخەڵكی بێن بۆخواردنی داهێراو بیدعەوخراپە.....وەهەروەها مەكروە وخراپە، كەس وكاری مردووكۆببنەوە بە مەبەستی ئەوەی كە خەڵكی تەعزیەیان لێبكات.....)

[20] حاشية إعانة الطالبين على حل ألفاظ فتح المعين/ج٢/ص٢٨٨_٢٨٩

١٠_وقال –في–الإقناع –وشرحه–من فقه الحنابلة: الجلوس للتعزية بأن يجلس المصاب في مكان ليعزوه أو يجلس المعزي عند المصاب للتعزية لما في ذلك من استدامة الحزن

وجزم شارح–المنية–وصاحب البحر–والفتح–من أئمة الحنفية بكراهتها في المسجد أيضاً.....)([21])

١١_قال صاحب الشامل وغيره:(وأما إصلاح أهل الميت طعاماً وجمع الناس عليه , فلم ينقل فيه شيء, وهو بدعة غير مستحبة).أ.ه([22])

---

[21] أنظر: اصلاح المساجد من البدع والعوائد/محمدجمال الدين القاسمي/ص١٤٢

[22] نيل الأوطار من أسرار منتقى الأخبار لشوكاني /ج٧/ص٤٧٤– حاشية

واتە:(بەڵام دروستکردنی خواردن لەلایەن کەس وکاری مردووەوە وخەڵکی لەسەرکۆبکرێتەوە، ئەوکارەهیچ بەڵگەیەکی لەسەرنەهاتووە، بەڵکو ئەوکارە داهێنراوە ورێگەپێدراو نیە)

١٢_وقال في كتاب -الحاوى الصغير- في مذهب الحنابلة:(.....وعنه يكره عند القبر لمن عزى ويكره الجلوس لها بعدها.....ويستحب لأقرباء الميت وجيرانه إصلاح طعام لأهله ثلاثاً, ويكره أن يصنعه أهله لجميع الناس.....).[٢٣]

١٣_وقال في كتاب-الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز-:(.....وينبغي اجتناب أمرين وإن تتابع الناس عليهما:

١_الإجتماع للتعزية في مكان خاص كالدار أو المقبرة أو المسجد.

---

[٢٣] الحاوى الصغير في الفقه على مذهب الأمام أحمدبن حنبل/ص١٣٣.

٢_اتخاذ أهل الميت لضيافة الواردين للعزاء,....وإنما السنة أن يصنع أقرباء الميت وجيرانه الميت طعاماً يشبعهم.....).([٢٤])

واته:(....پێویستە خۆپاریزی بكرێت لە دووكردار ئەگەرخەڵكیش لەسەری بڕۆن وئەنجامی بدەن:

١-كۆبونەوە بۆتەعزیە لە شوێنێكی دیاری كراودا وەك ماڵ یان گۆڕستان یان مزگەوت.

٢-میوانداری كردنی كەس وكاری مردوولەوكەسانەی دێن بۆتەعزیەكردن، بەڵكوسوننەت ئەوەیە كەكەس وكاری نزیكی ودراوسێكانی خواردن دروست بكەن بۆخاوەن مردووە، تا تێریان بكات وبرسێتییان لێدوربخەنەوە)

---

٢٤ الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز/د.عبدالعظيم بدوي/ص١٨٧ ك الجنائز.

١٤_وەهەروەهادروست نیە چلانەوسالآنە بۆمردووبگێڕدرێت هەروەك لەکتێبی(صحیح فقه السنة وأدلته وتوضيح مذاهب الأئمة)داهاتووەدەفەرموێت::(يكره الأجتماع للعزاء في مكان خاص _المآتم_.....وأما مايسمى بالخميس والأربعين والسنوية ونحو ذلك فإنها من البدع المحدثة المخالفة لدين الله سبحانه وتعالى ...السنة ان يصنع أقرباء الميت وجيرانه الطعام لأهل الميت.....,وأما ما اعتاده الناس من عكس هذه السنة وصناعة أهل الميت الطعام للمعزين فمكروه لأنه خلاف السنة ,).([٢٥])

١٥_قال العلامة محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله):(وقد صرح العلماء أن هذا الإجتماع بدعة وهذا إذاخلاف من المعاذير الشرعية–ويكره لهم فعله للناس–أي:صنع الطعام مكروه لأهل الميت , أي: يصنعوا طعاماً ويدعوا

[٢٥] صحيح فقه السنة وأدلته وتوضيح مذاهب الأئمة/ابو كمال السيد سالم/ج١/ص٦٦٥_٦٦٦

الناس إليـه لأن الـصحابة –رضـى الله عـنهم–كانوايعـدون صـنع الطعـام والإجتماع لأهل الميت من النياحة).([26])

١٦_وقال ايضاً:( المآتم كلها بدعة , سواء كانت ثلاثة أيام أو على أسبوع أوعلـى أربعـين يومـاً لأنهـا لم تـردمن فعـل الـسلف الـصالح (رضـي الله عنهم)ولوكان خيراً لسبقونا إليه ولأنها إضاعة مال, وإتلاف وقت...).([27])

واته:(ماتەم گێڕان وتەعزیەگێڕان بیدعە و داهێنراوە، جیـاوازی نییـە سـێ ڕۆژەبێت یاخود هەفتەیەك بێت، یاخود چلا نەبێت، چونکە ئەوکارە وارید نەبووە و نەگێڕراوتەوە لـەپێشینانی چاکمانەوە لــەهاوەڵان (ڕەزای خـوای لێبێت) خۆئەکەر"تەعزیە گێڕان" خێروچاکە بوایە ئەوەئـەوان پـێش ئێمـە

[26] الشرح الممتع على زادالمستقنع لأبن عثيمين/ج٥/ص٣٧٧ك الجنائز.

[27] الحلال والحرام في الأسلام لإبن العثيمين/ص١٥٤/أنظر :أحكام الجنائز لإبن العثيمين/ص٣٥٥/وانظر أحكام الجنائز: ص٢٥٥.

ئەنجامیان ئەدا، وەهەروەهائەوکارە ماڵ بەفیڕۆدان وکـات بـە فیڕۆدانێکـی بێسودە..)

١٧_قال شيخ الإسلام ابن تيمية(رحمه الله):(جَمْعُ أهل المُصيبة النـاس علـى طعامهم ليقرؤوا ويهدوا له ليس معروفاً عند السلف وقدكرههُ طوائف مـن أهل العلم من غيروجهٍ).انتهى

١٨_وقال الطرطوشي:(فأما المآتم :فَمَمنوعة بإجماع العلمـاء , والمـآتمُ هـو الأجتماع على المصيبة وهو بدعةً منكرة, لم يُقبل فيه شيءً, وكذا مابعده من الأجتماع في الثانى والثالث والرابع واالسابع والشهر والسنةِ فهو طامة وإن كان من التركة وفي الورثة محجور عليـه أو مـنْ لم يـأذنْ حـرم فعلـهُ وحَـرُمَ الأكلُ منه).أ.ه

واتـە:(بـەڵام تەعزیـە گێـڕان و ماتـەم گێـڕان قەدەغـەکراوە بـەئیجماع وکۆدەنگی زانایان ....)

٢٠-قال في جواب سوأل اللجنة الدائمة (برقم /٥٠٩٠):(صنع الطعام من أهل الميت للمشيعين بدعة لايجوز عملها بل هو من أمور الجاهلية).

واته:(دروستكردني خواردن لەلایەن كەس وكاری مردووەكەوە بۆئەوانەی مردووەكەیان ناشتووە یان ئەوانەی هاتوون بۆتەعزیەكە داهێنراو بیدعەیە ، ودروست نییە بەڵكو كردارێكی نەفامی وجاهیلیەتە)

٢١_وقال أيضاً:(الإجتماع عند مضي أربعين يوماً على وفاة الميتبدعة وقراءة القرآن أو مايسمى بالختمة للميت بدعة ثانية , وأكل هؤلاء القرآن ماقدم هم من الطعام وأخذهم الأجرة على القراءة حرام , وكذلك إحياء الذكرى السنوية للميت بمثل ذلك حرام ولايجوز أخذأجر مجرد قرأة القرآن لأن قراءته عبادة محضة فكل هذه الأعمال وأخذ الأجر عليها لايجوز.... فقد

ذكر الشيخ الإسلام ابن تيمية إجماع أهل العلم أن أخذ الأجرة على مجرد التلاوة محرم عند أهل العلم لانزاع بينهم في ذلك).([28])

٢٢_قال أبوداود(رحمه الله):(سمعت أحمد(رحمه الله)سئل عن القراة عند القبر فقال لا).([29])

أبوداود(رحمەالله)دەفەرموێت:( بیستم پرسیارکرا لەئیمامی ئەحمەد(رحمەالله)سەبارەت بە قورئان خوێندن لەلای گۆڕدا ئەویش فەرموی: نەخێر-واتە نادروستە-)

٢٣_بەڵکولای ئیمامی شافعی(رحمەالله) قورئان خوێندن بەسەرمردودا بیدعە بووە، هەروەك شێخ الإسلام(رحمەالله) دەفەرموێت:(ولا يحفظ من

[28] اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والأفتاء السؤل الثالث من الفتوى رقم/٦١٦٧

[29] المسائل لأبى داود/ص١٥٨

الشافعي نفسه في هذه المسألة -قراء القرآن عند الدفن- كلام ذلك لأن كل عنده بدعة).([30])

٢٤_قال ابن أبي حمزة(رحمه الله):(وهو من أئمة المالكية في حكم القراءة عند القبر قال: القرأة عند المقابر بدعة وليس بسنة).([31])

واته:(ابن أبى حمزه كەيەكێكە لەزانایانى مالیكیەكان سەبارەت بەحوكمى قورئان خوێندن لاى گۆڕدا دەفەرموێت: قورئان خوێندن لاى گۆڕدا بیدعەوداهێنراوە وسوننەت نیە)

٢٥_قال الإمام ملا على القاريء(رحمه الله):(النفي في كتاب الفقه الكبير -ثم القراءة عند القبور مكروهة عند أبي حنيفة ومالك وأحمد).([32])

[30] اقتضاء الصراط المُستقيم/ص١٨٢.

[31] الأقوال المنتقات فيما ينفع الميت بعد الوفاة/ص١٧٠.

[32] الأقوال المنتقات فيما ينفع الميت بعد الوفاة/ص١٧٠.

٢٦_قال الشيخ العلامة صالح فوزان الفوزان (حفيظه الله):(ولا ينبغي الجلوس للعزاء والإعلان عن ذلك، كما يفعل بعض الناس اليوم ......أما مايفعلهُ بعضُ الناس اليوم من أن أهل البيت يُهيئون مكاناً لإجتماع الناس عندهم ويصنعون الطعام ويستأجِرون المُقرئين لتلاوة القرآن ويتحملون في ذلك تكاليف مالية , فهذا من المآتم المحرمةِ المُبتدعة....).([٣٣])

بەڵێ موسڵمانی خۆشەویست :کۆبونەوە بۆتەعزیەگێڕان لەشوێنێکی تایبەتیدا وخواردن دروستکردن بەو بۆنەیەوە و قورئان خوێندن لەتەعزیەداو فرۆشتنی(یان ئەگەربەبێ پارەش بیخوێنێت)وخێمەدانان وپارەدان بۆتەعزیەخانە دروستکردن جا لەمزگەوتدابێت یاخود هۆڵی تایبەتی بۆدروستبکرێت وەك لەهەندێك شوێن ناویان ناوە (هۆڵی بۆنەکان) وچون بۆتەعزیە لەوشوێنانەدا هەموی ناشەرعین، وپێویستە خۆمانیان لێبپارێزیت، وەپێویستە لەسەرهەموو لایەکمان پێش مردنمان

---

[٣٣] الملخص الفقهي /ج١/ص ٢٤٧–٢٤٨.

وەسیەتی ئەوەبکەین کە لە دوای مردنمان تەعزیە مان بۆدانەنێن، چونکە لەشەرعی خوادا ڕێگە پێدراونیە.

وە بەپێویستی دەزانم لێرەدا ئاماژەبەوەبکەم کە لەزۆرێك لەناوخەڵکی عەشیرەتەکاندا سندوقیان هەیە ومانگانە یاخود ساڵانە خەڵکی ئەو تائیفەیە پارەی تێدەکەن بۆمەسرەفی تەعزیە کردن، کەکەسێکیان لێمرد، بەژداری کردن لەم جۆرە کارانە داو پارەدان بۆتەعزیە گێڕان ناشەرعیە ویارمەتیدانە لەناشەرعیدا، بۆیە پێویستە وازی لیبهێنرێت، یاخود ئەگەر هەرحەزدەکەن خێر بکەن بائەو پارەیە لە پێویستی موسڵمانێکداسەرف بکەن کەپێویستی پێیەتی، یان یارمەتی کەسێکیانی پێبدەن کە هەژارە ، یان نەخۆش وبێتوانایە، یاخود بۆپێکەوەنانی خێزان بۆگەنجێك سەرفی بکەن، ئەمانە کاری خێرو چاکەن بەڵام پارەدان بۆتەعزیە خانە دروستکردن و تەعزیەگێڕان ناشەرعیەو پێو یستە خۆمانی لێبپارێزین.

ئەگەردەتـەوێت سـەبارەت بەوانـەی لـەپێـشدا باسمـان کـرد (سـەبارەت بەحوکمی تەعزیە گێڕان وقورئان خوێنـدن بۆمردوونـاردنی پاداشـتەکەی بۆمردوو )زیاترزانیاری بەدەست بهێنیت بڕوانەئەم کتێبە بەناوی:

﴿الأقوال المُنتقات فيما ينفـع الميـت والوالـدين بعـد الوفـاة وحكـم قـراءة القرآن عند:الإحتضار–الدفن–زيارة القبوروإهداءُ الثواب للأمـوات –مـع إدراج فتاوى اللجنة الدائمة وعلماء البلد الحرام–﴾

اعداد: أبو أنس محمد بن حسن سُليمان.

وەبڕوانە نوسراومان بـەناوی:(ئاگادارکردنـەوەی موسـڵمانان سـەبارەت بەڕونکردنەوەی هەندێك لـەچەواشە کاریەکان وەڵامێك بـۆکتێبی ئـارامی دڵان) نوسینی:زاناعثمان پێنجوێنی/ پێداچونەوەی بـەڕێز: مامۆستاهوشـیار ئەحمەدمحمـــد پێـــشنوێژو وتـــارخوێنی مزگـــەتی گـــەورەی ئـــازادی لـەبازیان.لاپەڕەکانی(٦١تـــا٧٠)

## پێویسته لەسەر هەمووموسڵمانێک کەلەپێش مردنیدا وەصیەت بنوسێت بۆدوای خۆی

بـەڵێ موسـڵمانی خۆشەویـست: یـەکێك لەجوانیـەکانی تـری ئیـسلام وئامۆژگاریەکانی بۆئێمە ئەوەیە کـە پێویـستە لـەسەرهەرکەسـێك لـەئێمـە وەصیەت وئامۆژگاری بکات یان بنوسێت بـۆدوای خـۆی، کەبەداخـەوە زۆرێك لـە موسڵمانان ئەمەیان پشت گوێ خـستووە ، یـان لـەبەرئـەوەی نازانن کەئەمە لـەشەرعی خوادا هاتووە، یان لـەبەر ئەوەخۆشەویستی دونیا بەشێوازێك چوەتە ناودڵیانەوە کەمردنیان لـەبیرکردووە، یان زۆربـەدوری دەبینن مردن ڕویان تێبکات !!!

خوای گەورەدەفـەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى

ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾البقرة

واته:(لەسەرتان نوسراوە–وبەشەرع بۆتان گێڕدراوە–هەركەسێكتان كەوتەسەرەمەرگ وماڵ وداراییەكی لەدوابەجێما دەبێ بەشێوەیەكی چاك وپەسەند وەسیەت بكات كەباوك ودایك وخزمانی–ئەوانەی میراتیان بەردەكەوێت–هەركەسە و بەشی خۆی پێبگات بەچاكی، ئەمكارەحەق وپێویستە كەكەسانی ئەهلی تەقواوچاكەكاران پێی هەڵبسن وئەنجامی بدەن–كەواتە وەسیەت كردن سیفەتی خۆپاریزان وتەقواكارانە– ئینجاهەركەس دوای بیستنی وەسیەتەكە و ئاگاداربونی پێی – ئەووەسیەتە–بگۆڕێت وكاری پێنەكات ئەوائەوكەسانە كەدەیگۆڕن تاوانباروگوناه كارن، بەڕاستی خوا زۆر بیسەر وزانایە، هەركات كەسێك هەستی كرد وەسیەت كارلەوەسیەتەكەیدا ناهەق بووەو خۆی توشی

گوناه کردووه هەوڵیدا میرات گرانی پێك پێك بهێنێت گوناحێکی ناگات، بەڕایستی خوالەگوناه دەبورێ و بەبەزەیی ومیهرەبانە)

بەڵێ پێویستەوەسیتەت بکەیت و وە پێویستە وەسیەتەکەت بەهەق بێت، بەشێوازێك پێچەوانەی شەرعی تێدا نەبێت، وەك ئەوەی وەسیەت بکات بەوەی کە ماڵەکەی لەحەرامدا بەکاربهێنرێت!!

یان هەندێك بێبەش بکات لەمیراتی وبەهەندێکی تری بدات-وەك ئەوەی میراتی تەنهابدرێت بەکوڕەکانی وکچەکانی لێ بێبەش بکات یان خێزانی لێ بێبەش بکات!!

یان بڵێت بۆتەعزیەکەم بەکاری بهێنن!!

یان بڵێت ئیسقاتم بۆبکەن لێی!!

یان مزگەوتێکی دروستکردووە-جاخۆی یان باوکی یان لەهەرمزگەوتێکی تردا-بڵێت لەوێ بم نێژن وئەسپاردەم بکەن....

وەهاو وێنەی ئەم وەسیەتانە کەناشەرعی وزوڵمی تێدابێت، نابێت کەسی موسڵمان وەسیەتی بەوشێوازەبکات، وە ئەوکەسانەی شاهیدی ئەووەسیەتەن نابێت هیچ شتێك لەوەسیەتەکە بگۆڕن وفێڵ وخیانەت بکەن، خۆئەگەر وایان کرد ئەوە کەسی وەسیەت کارتاوان بار نییە، بەڵکو ئەوکەسانە گوناهکاروخراپەکارن ولەقیامەتدا بەرپرس دەبن لەوکارەیان!! خۆئەگەرکەسی وەسیەتکار وەسییەتی ناشەرعی کردبوو یان نوسیبوو، ئەوە نابێت ئەووەسیەتەی جێبەجێ بکرێت!!!

پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەوەسیەتکردن فەرمویەتی:(ماحق امرىء مسلم له شيء أن يوصي فيه يبيت ليلتين إلا ووصيته مكتوبة عنده)أخرجه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي والترمذي

واتە:(پێویستە لەسەرهەموموسڵمانێك کەدوو شەوی بەسەردانەیەت ئیللا ئەبێت وەسیەتەکەی لای سەری نوسرابێت)

هەربۆیە عبدالله ی کوڕی عمر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێت:(هیچ شەوێکم بەسەردانەڕۆیشتووە لەوکاتەوەکەگوێم لەپێغەمبەری خوابووەﷺ ئیللاوەسیەتەکەم لەژوری سەرمەوەبووە)!!

بێگومان لەوەسیەت کردن یان نوسینیدا پیاوان وئافرەتان وەك یەکن ویەکسانن-واتەوەسیەتکردن بۆئافرەتانیشە-ئەمەش چۆنێتی وەصیەتکردنی شەرعی یە فەرموون:

# وەسیێتی

# شەرعی

ئامادەکردن بەڕێز

مامۆستا یحیی ستار شیخانی

لە بڵاوکراوەکانی ماڵپەڕی ئاشتی

www.ashtyk.com

پرس کراوە بەمامۆستای بەڕێز و بە ڕێزیان ڕازی بوون لەبڵاوکردنەوەی ئەم نوسینە بەسودەی لەگەڵ ئەم نامیلکەیەدا( خوای گەورە پاداشتی بەڕێزیان بداتەوە )

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله نحمده و نستعينه و نستغفره, و نعوذ بالله من شرور أنفسنا و من سيئات أعمالنا, من يهده الله فلا مضل له و يضلل فلا هادي له و أشهد أن لا إله إلا الله و حده لا شريك له و أشهد أن محمدا عبده و رسوله.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ آل عمـــــــــــــــــــــــــران ١٠٢

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء: ١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب: ٧٠ – ٧١

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله و خير الهدي هدي محمد صلى الله عليه و سلم و شر الأمور محدثاتها و كل محدثة بدعة و كل بدعة ضلالة و كل ضلالة في النار.

**خوشك و برائ موسلمان ...**

ئەم نامیلکەیەی, کە لە بەردەستانە بریتیە لە وەسێتێکی شەرعی, کە خوای گەورە خۆی فەرمانی پێکردووە لە قورئانی پیرۆزدا, وەکو دەفەرموێت:﴿وَوَصَّىٰ

بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَـٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ رَبَّنَا البقرة: ١٣٢

**واته:** ئیبراهیم و یەعقووب (سەلامی خوایان لێ بێت)، ئەو ئایینەیان بە کوڕەکانیان وەسێت کرد و ڕاسپارد، گوتیان: ڕۆڵەکانم..! بێگومان بن کە خوای گەورە ئەم ئایینی یەکتا پەرستییەی هەڵبژاردووە بۆتان، دەسا ئێوەش هەوڵ بدەن، کە تەنیا و تەنیا بە موسڵمانێتی بمرن، واتە: تەنها ساتێك لەم دینە دوور نەکەونەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((**ماحق امرئ مسلم له شيء يريد أن يوصي فيه يبيت ليلتين إلا و وصيته مكتوبة عنده**)). {أخرجه البخاري ومسلم و أبو داود و النسائي و الترمذي} .

**واته:** پێویستە لە سەر هەموو موسڵمانێك، کە دوو شەوی بە سەردا نەیەت ئیلا ئەبێت وەسێتەکەی لای سەری نوسرا بێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هیچ شەوێکم لە دەست نەچووە لەو کاتەوە, کە گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە (**صلی الله علیەوسلم**) ئیلا وەسێتەکەم لە ژووری سەرم بووە.

بۆیە بە ئەرکی سەر شانی خۆمانی دەزانین, کە موسڵمانان ئاگادار بکەینەوە لەم سوننەتە پشت گوێ خراوە و ڕێنمونیان بکەین بە شێوازێکی شەرعی وەسێتەکانیان بکەن, هەروەها لە ناو خاڵە وەسێت پێ کراوەکاندا چەندەها سوننەت زیندوو دەکرێنەوە لە سەرە مەرگەوە تا بە خاك سپاردن, هەروەها ئەم وەسێت کردنە سوننەتە بۆ پیاوان و ژنان وەك یەك ((**إنما النساء شقائق الرجال**)){السلسلة الصحيحة " ٦ / ٨٦٠ }.

هۆی نووسینی ئەم وەسێتەش ئەوەیە, کە خەڵکی بە گشتی وازیان لەم سوننەتە هێناوە و پشت گوێیان خستووە, لە گەڵ ئەوەشدا کە زۆر گرنگە, هەروەها دەبێتە یادکردنەوەیەك بۆ ئەوەی, مردنت لە یاد نەچێت .

بۆ نموونە تۆ هەندێك پارەت بە قەرز هێناوە لە جێگایەك تەنها خۆت دەیزانیت و ماڵ و منداڵیشت لێی بێ ئاگان, ئەو کاتە نەدانەوەی دەبێتە هۆکارێك بۆ نەچونە ناو بەهەشتەوە تاوەکو ئەو قەرزە بدرێتەوە, بەڵام ئەگەر تۆ وەسێتت کردبێت ئەوکاتە ڕزگارت دەبێت لەو کێشەیە.

هەروەها خەڵکانێکی زۆر بێ ئاگان و نازانن ئەو شتانە چیین وەسێتی بۆ بکەن, کە نادروستە ئەنجام بدرێت لە کاتی مردن و دوای مردنیشدا, بۆیە هەستام بەم کارە, پاش ڕاوێژکردن لە گەڵ چەند مامۆستایەکی ئایینی, ئەوانیش هەمان هەڵوێستیان هەبوو.

داوا لە خوای گەورە دەکەم, کە موسڵمانان سودمەند بن لێی و وەسێتەکانیان بکەن بە شێوەیەکی شەرعی, کە خوای گەورە لێی ڕازی بێت.

والحمدلله أولاً وآخراً

**یحیی ستار محمد**

**ئەمەیە وەسێتەکەم:**

من شایەتی ئەدەم, کە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت بە حەق جگە لە (الله) تاك و تەنهایە و شەریکی نییە, هەروەها **محمد** (صلی الله علیەوسلم) بەندە و نێردراوی ئەوە و ڕۆژی قیامەت دێت و هیچ گومانێکی تێدا نییە و خوای گەورە خەڵکی زیندوو دەکاتەوە لە ناو گۆڕ, هەروەها وەسێت دەکەم بۆ کەس و کارم لە دوای خۆم تەقوای خوای گەورە بکەن و چاك بن لە گەڵ یەکدا و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیەوسلم) بکەن.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٣٢﴾ البقرة: ١٣٢.

**واته:** ئیبراهیم و یەعقووب (سەلامی خوایان لیٚ بیٚت)، ئەو ئایینەیان بە کوڕەکانیان وەسیٚت کرد و ڕاسپارد، گوتیان: ڕۆڵەکانم.. !بیٚگومان بن کە خوای گەورە ئەم ئایینی یەکتا پەرستییەی هەڵبژاردووە بۆتان، دەسا ئیٚوەش هەوڵ بدەن، کە تەنیا و تەنیا بە موسڵمانیٚتی بمرن، واتە: تەنها ساتیٚك لەم دینە دوور نەکەونەوە.

وە وەسیٚت ئەکەم بۆ ئەم شتانە:

١- لە کاتی مردنمدا چەند پیاو چاکیٚك لە دیار سەرم بن بۆ ئەوەی بەیادم بهیٚننەوە کەوا گومانی باشم هەبیٚت بە خوای گەورە .

٢- شایەتمانم پیٚ بهیٚنن.

٣- لە کاتی مردنمدا غەیری دۆعای خیٚر زیاتر هیچی تر نەڵیٚن.

٤- پەلە کردن لە کفن کردنمدا .

٥- شیوەنم بۆ نەکریٚت و ڕازی نیم بەو کارە چونکە حەرامە و شەرعی نییە.

٦- دەنگ بەرز نەکردنەوە و لاوانەوە بە هیچ شێوەیەك چونکە هەمووی حەرامە.

٧- چاوەکانم دابخرێت و بە پارچە قوماشێکیش هەموو گیانم داپۆشن و رێگر نیم لەوانەی کە مەحرەمن ماچم کەن.

٨- هەروەها قەرزەکانم بۆ بدەنەوە ئەگەر هەموو ماڵەکەشم بگرێتەوە, ئەمەش

قەرزارییەکانمە:........................................

..................................................

..................................................

..................................................

..................................................

..................................................

..................................................

..................................................

..................................................

٩- ئەو کەسەی زیاتر بە سوننەت شارەزایە بمشۆرێتەوە و ئەگەر لە کەس و کارم بێت باشترە, ئەگەر عەیبێکیش لە گیانمدا بوو بیشارێتەوە.

١٠- هەروەها زێدڕەوی نەکەن لە کفن کردنمدا و لە سێ پارچە زیاتر نەبێت چونکە ئەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی پارە و پول ئەویش قەدەغە کراوە لە شەرعدا .

١١- ئافرەتان دوای جەنازەکەم نەکەون.

١٢- خەڵکانێکی زۆر نوێژ بکەن لە سەرم چونکە سودێکی زۆری بۆم هەیە.

١٣- کەسێك پێش نوێژی جەنازەم بکات قورئانی زۆر لە بەربێت و شارەزاتربێت بە سوننەت و بە نییەتێکی پاکەوە دۆعام بۆ بکەن, ئیمام لای سەرم بوەستێت و ئەگەر ئافرەتیش بوو ئەوە لە ناوەڕاستی بوەستێت. هەروەها لەو سێ کاتەی کە قەدەغەکراوە نوێژم لە سەر نەکرێت و نەنێژرێم, مەگەر لەبەر ناچاری بێت:

ناشتن لەو کاتانەدا کە لە فەرموودەکەی (عوقبة) ی کوڕی (عامر) دا باس کراون کە دەفەرموێت: ((ثلاث ساعات كان رسول الله (صلى الله عليهوسلم) ينهانا أن نصلي فيهن، أو أن نقبر فيهن موتانا: حين تطلع الشمس بازغة حتى ترتفع، وحين يقوم قائم الظهرة حتى تميل الشمس، وحين تضيف الشمس للغروب حتى تغرب))

أخرجه مسلم (٢ / ٢٠٨) وأبو عوانه في صحيحه (١ / ٣٦٨) وأبو داود (٢ / ٦٦).

واتە: سێ کات هەیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کردووین کە نوێژی تێدا نەکەین و مردووەکانمانی تیا نەنێژین , لە کاتی خۆری بەرەبەیاندا تاکو خۆر بەرز دەبێتەوە و لەو کاتەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لا دەدات بەرەو خۆر ئاوا بوون , وە لەو کاتەی خۆرە زەردەی ئێواران تاکو خۆر ئاوا دەبێت.

١٤- قەبرەکەم قووڵ و فراوان بێت, وە ئەگەر بگونجێت (لحد) بێت.

١٥- ئاساییە گەر لە گەڵ یەکێکی تردا بنێژرێم گەر پێویست کرا و هەر کەسێکمان باشتر و شارەزا تر بوو لە دیندا پێش بخرێت.

١٦- وە کەس و کار و خزمانم ئەولاترن لە خەڵکی کە دامگرن بۆ ناو قەبرەکە.

١٧- بێ دەنگ بن و دەنگیان بەرز نەکەنەوە تەنانەت بە زیکریش لە کاتی بردنی تەرمەکەمدا چونکە بیدعەیە.

١٨- ئەو کاتەی دام ئەگرن بۆ ناو قەبرەکە بڵێن (بسم الله وعلى سنة رسول الله) .

١٩- لە سەر قەبرەکەم نەنوسرێت و بستێك زیاتر لە سەر زەویەوە بەرز نەکرێتەوە.

٢٠- هەروەها ئەو تەلقینە بیدعەیە نەخوێندرێت لە سەر قەبرەکەم کە ئێستە باوە لە ناو خەڵکیدا.

٢١- دوای ناشتنم چەند کەسێك لە خزمانم لە سەر قەبرەکەم بوەستن بە قەدەر ئەوەی کە حوشترێك سەر ببریت و گۆشتەکەی دابەش بکرێت(نزیکەی سەعاتێك) وە داوای جێگیر بوونم بۆ بکەن لە کاتی پرسیارکردنی مەلائیکەکاندا بۆ وەڵامدانەوەیان.

٢٢- کەس و کارم بۆیان هەیە تەعزێ باریان لێ بکرێت پاش ناشتنم بە مەرجێك لە شوێنێکی دیاری کراو کۆنەبنەوە بۆ تەعزێ واتە شوێنێك تەرخان نەکرێت وەك مزگەوت یان هۆڵ یان خێوەت.

٢٣- کۆنەبنەوە بۆ قورئان خوێندن وەك لە تەعزێدا ئەکرێت یان (ڕۆژانی پێنج شەممە – چلە – ساڵانە) ئەنجام ئەدرێت ئەوانە هەمووی بیدعە و داهێنراو و حەرامن.

٢٤- خواردن دروست نەکردن بۆ خەڵکی بەڵکو لە سەر دراوسێیە خواردن دروست بکات.

٢٥- هەروەها ماڵ و خزمانم دۆعام بۆ بکەن و ئەگەر ڕۆژووی نەزرم لە سەر بوو بۆم بگێڕنەوە, وە ئەگەر ڕۆژووی فەرز قەرزار بووم فیدیەم بۆ بدەن.

٢٦- داواکارم لە منداڵەکانم کە جێماون لە دوای خۆم تەقوای خوای گەورە بکەن و کردەوەی چاك بکەن و صەدەقەم بۆ بکەن و حەج و عومرەشم بۆ بکەن گەر بتوانن.

٢٧- بۆ خزم و کەس و کارم هەیە سەردانی قەبرەکەم بکەن بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری وەربگرن و کارێك نەکەن کە خوای گەورە تورە بکات, وە ئادابی شەرعی ڕەچاو بکەن لە سەردانی قەبرستاندا.

٢٨- هەروەها دروستە تا سێ یەکی ماڵەکەم بکەم بە صەدەقە و بدرێت بەوانەی, کە موستەحەقن لە فەقیر و هەژاران, یان بدرێت بەمانە:

(..........................................................

..................................)چونکە بۆم

هەیە سێ یەکی ماڵەکەم بدەم بە هەژاران لە دوای مردنم، نەك بۆ میرات گرەکانم، وە پێویستە لە سەریان وەسێتەکەم نەگۆڕن.

| | وەسێت· بۆ کراو | ئەو شتەی کراوە بە وەسێت |
|---|---|---|
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |

هەروەها بێجگە لەوە ماڵەکەم دابەش بکرێت وەکو چۆن لە قورئان و سوننەتدا هاتووە.

ئەمەیە کە بەندەی فەقیر وەسێتی کردووە کە ماڵ و منداڵم کاری پێ بکەن لە دوای مردنم ئەگەر بیکەن ئەوە

ئەجر و پاداشتیان بۆ هەیە, وە تەبەڕا ئەکەم لە هەموو کار و وتەیەك کە پێچەوانەی شەرعە یان پێچەوانەی ئەوەیە کە نووسیومە لەم وەسێتەدا, ئیلا گەر فەرمانێکی شەرعی بێت نەمنوسیبێت.﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٨١﴾البقرة: ١٨١

**واتە:**(هەر کەس دوای بیستنی وەسێتەکە و ئاگادار بوونی بیگۆڕی و کاری پێ نەکا ئەو کەسانەی دەیگۆڕن تاوانبارن, وەسێت کار گوناهێکی لەسەر نییە, بە ڕاستی خوای گەورە زۆر بیسەر و زانایە, خۆی چاك دەزانێ هەر دەستکاریەك بۆ ڕێکخستن بێت قەیناکا و پاداشتی هەیە).

**سەرنج:**

داواکارم له موسڵمانان، هەر تێبینیەکیان هەیە دەربارەی ئەم بابەتە, پەیوەندی بکەن بەم ناونیشانەی خوارەوە, بۆ ئەوەی ڕەچاوی بکەم و موسوڵمانان زیاتر سوودمەندبن خوای گەورە پاداشتی هەموان بداتەوە

وەسێت کار :

شاهیدی یەکەم :

شاهیدی دووەم :

**لە دۆعای خێر بێ بەشمان مەکەن**

**والحمدلله أولاً وآخراً**

**وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه وسلم**

ژ. مۆبایل: ٠٧٧٠١٢٨٤٥٣١

yahya.setar@yahoo.com

**خۆت بپارێزە لەباوەڕبون وئەنجامدانی ئە م ناشەرعی وزیادکراوانە کە لەئیسلامدانییە!!!**

١-دانانی قورئان لەلای سەری ئەوکەسەوەکەلەکاتی مردندایە...

٢-خوێنــدنی ســـورەتی (یاســـین) یــان هەرســـورەتێکی تربەســـەر ئەوکەسەداکەلەکاتی مردندایە.

٣-دەرکردنـی ئەوئافرەتانـەی کەلــە ســورِی مانگانــەدان لــەدەوری مردووەکە.

٤-بیروباوەڕبونی کەسانێك بەوەی کەدەڵێن ڕۆحیانەتی مردووەکە دوای سێ چوار شەودێتەوە ئەوشوێنەی کەتێیدامردووە.

٥-نینۆك کردن وڕیش تاشین بۆمردووەکە لەکاتی شۆردنیدا.

٦-لۆکە خستنە پاش ودەم ولوتی مردووەکەوە.

٧-خۆڵکردنە چاوی مردووەکەوە ولەوکاتەداوتنی(چاوی مرۆڤ تەنهاخۆڵ تێری دەکات)!!

٨-کەس وکاری مردووەکە نان ناخۆن هەتا کەسەمردووەکە نەنێژرێت.

٩-خەم وخەفەت وتەعزیە باری بۆماوەی یەك ساڵ(بەڵکوئافرەتی مێرد مردووتەنهابۆی هەیەچوارمانگ ودەڕۆژ تەعزیە باربێت) بەوەی کە ئافرەتان(بەهەمان شێوە پیاوانیش) پۆشاکی جوان لەماڵەوە لەبەرناکەن، یاخود پۆشاکی ڕەش پۆشین کەوەك نارەزاییە بەرامبەر بە قەزاوقەدەری خوای گەورە.

١٠-هەندێك لـە پیاوان تاماوەیـەكی زۆربـەهۆی مردنـی ئەوكەسـەیانەوە ڕیشی دەهێڵێتەوە ودوای ماوەیەك دەیتاشێ ، ئەمە كردارێكـی ناشـەرعیە چونكە هەموكاتێك ڕیش تاشین حەرامە بـەڵكو واجبـە ڕیـش بهێڵرێتـەوە نەك بتاشرێت!!

١١-كەسێك كەهەواڵی مردنی كەسێكی پێدەگات دەڵێـت(الفاتحـة)!! بەڵكودروست ئەوە بڵێیت(إنالله وإنا إليه راجعون).

١٢-زیكركردن بەدەنگی بەرز لـەكاتی شۆردنی مردوودا.

١٣-ناشتنی مردوو لـەگۆڕستانێكی دوور چونكە فلانـە پیاوچـاك لــەوێ نێژراوە وسود بەم مردووە دەگەیەنێ.

١٤-نوسینی ناوی مردووەكە، یان نوسـینی ووشـەی شـەهادەتەین، یـان نوسینی دوعا لـەكفنی مردووەكە.

١٥-ڕازاندنەوەی تابوتەکەی، وجەنازەکە بەگوڵ وکەل وپەلی ڕازاندنەوە، وهەڵواسینی ڕەسمێکی مردووەکە پێیدا، یاخود (ئالاّوعەلەم)ی ئەوولاّ تە دەدرێت بەسەرجەنازەکەداکە ئەم کارەش نادروستە!!

١٦-کەسانێك بیروباوەڕیان وایە ئەگەرجەنازەکە سوك بێت لەهەڵگرتندا ئەوە نیشانەی عاقیبەت خێرییە بۆی!!

١٧-نزیك نەکەوتنەوە لە جەنازەکە.

١٨-دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی هەڵگرتنی جەنازەدا، جائەگەرزیکرکرنیش بێت نادروستە.

١٩-هەڵواسینی لافتە بەبەردەرگای مزگەوتەوە یاخودبەدەرگای ماڵەکەیەوە،کەناوی مردووەکەی تێدایە، ولێیی نوسراوە(خوالێخۆش بوو فلاّنەکەس!! تۆچۆنت زانی خوالێی خۆش بووە ئەمەش هەڵەیەکی ترە وپێویستە خۆپارێزی لێبکرێت)

٢٠-دوعای دەستپێکردنی نوێژ(الإستفتاح)لەنوێژی مردوودا(چونکە ئەوە پێویست نیە لەنوێژی مردوودا بخوێندرێت).

٢١-وەستانی ئیمام لەناوەڕاستی پیاوی مردوودا و وەستانی لەئاستی سنگی ئافرەتی مردوودا(بەڵکولای سەری پیاوە وە دەوەستێت ولەناوەڕاستی ئافرەتەوە کەئەمە شێوازی شەرعییە )

٢٢-لەدوای نوێژکردن لەسەری ئیمام دەڵێت بەخەڵکەکە چی شایەتیەکی بۆدەدەن ؟ هەموودەڵێن:(پیاوی چاك وصالح بووە).

٢٣-بانگ دان لەکاتی ناشتنی مردوودا.

٢٤-لم وخۆڵی نەرم ڕاخستن بۆمردوو بەبێ بونی پێویستیەك، یان پۆشاك ڕاخستن بۆی لەگۆڕەکەیدا.

٢٥-عەتروبۆنی خۆش ڕشتن بە گۆڕەکەیدا، یاخود گرتنەوەی گولاو ڕشتنی بەگۆڕەکەیدا.

٢٦-تەڵقین کردنی مردوودوای ناشتنی،.(دوای مەترێك خۆڵ تەڵقینی مردووەکەدەکات و بەکاغەز دەیخوێنرێتەوە وخۆیشی لەبەری نیە دوای چەندساڵ تەڵقین کردن!! بەڵام دەیەوێت ئەومردووە بەچەند دەقیقەیەك لەبەری بکات!!!

٢٧-دانانی خواردن لەسەرگۆڕەکەی تاخەڵکی لێی بخۆن!!

٢٨-خێروخێراتکردن لەسەرگۆڕەکەی بەبیانوی ئەوەی خێری زیاترە، وزوتر پێی دەگات!!!

٢٩-لەدوای سێ ڕۆژ زیاتر بۆت نیە تەعزیەو سەرە خۆشی لە کەس وکاری مردوو بکەیت!!

٣٠-مردووەکە چی خوادنێکی پێخۆش بووە لەوخواردنەی بۆدەکرێت بەخێر!!!

٣١-(ئیسقات) کردن بۆمردوو بەوەی پارە دەدەن بەخێر لەبری ئەو نوێژانەی فەوتاندویەتی یان لەباتی ئەودرۆیانەی کردویەتی یان ........ یان...(کەئەم کارە دەست بڕینێکی ئاشکرایەو لەهیچ شوێنێکی شەرعدا جێی نابێتەوە)

٣٢-خێمە هەڵدان بەسەرگۆڕدا، یان خانو دروست کردن بەدەوریدا، یان دەورگرتنی بە شیش وئاسن وچادرکردن بۆی، وهەڵبەستنی، وچیمە نتۆو گەچ کاری کردن، وکاشی کردن، ودانانی شوێنی دانیشتن لەدەوری گۆڕەکەیدا!!!

٣٣-نوسینی وشەی(خوالێخۆش بوو)لەکێلەکەی(تۆچۆنت زانی خوالێی خۆش بووە)؟؟ یان نوسینی قورئان وشیعر وپیاهەڵدان لەسەرگۆڕ کە ئەمانە هەموی حەرام وناشەرعین!!

٣٤-هەموورۆژێکی جومعە یان ڕۆژانی جەژن سەردانکردنی مردوو یان دیاریکردنی هەررۆژێکی دیاری کراوی ترا!

٣٥-سـێ ڕۆژانـه وهەفتانـه وچـلانه و سـالأنه وخەتمـەكردن لەسەرگۆڕەكەی!!!

٣٦-گرتنی كەسێك بـەكرێ كـەقورئانی بەسـەردا بخوێنێـت(خۆئەگـەر بەپارەش نەبێت وهەرخۆیشت بیخوێنیـت ناشـەرعییە چـونكە قورئـان بـۆ زیندووەكانە كەبیخوێننەوەو لێـی تێبگـەن وكـاری پێبكـەن نـەك بەسـەر مردووگۆڕەكاندا بیخوێنن)!!

٣٧-ئـاوكردن بەسـەرگۆڕدا بۆفێـك كردنـەوەی مردووەكـە!! یـان سوككردنی سزا لەسەری!!

٣٨-خەتمە كردن لای گۆڕدابەوەی كۆمـەڵێك مـەلا دەهێـنن دوو سـێ سەعات بەسەرگۆڕەكەدا دەڵێن(لا إلـه إلا الله)وەلـەدوایدا (لـەفەو خواردن وبیبسی) دابەش دەكەن!!

٣٩-كاتێك دەچن بۆسەرگۆڕ بەپێوە لەسەری دەوەسـتن، وەك چـۆن لـە نوێژدادەست دەگرن دوای ماوەیەك ئینجادادەنیشن

٤٠-کەسانێك لەئافرەتان بیروباوەڕیان وایە خۆداپۆشین تەنها بۆکاتی چونە گۆڕستانە چونکە دەبێت شەرم لەمردووەکەبکات!!! بەڵام لەجگە گۆڕستان خۆی ڕوت دەکاتەوە نەشەرم لەخوادەکات نەلەوخەڵکە زیندووەش کەدەیبینن !!

٤١-ناردنی سەلام بۆمردوو بەوکەسەدا کەدێت بۆلای گۆڕەکەی !!!

٤٢-بەتەسبیح زیکرکردن کەناوی دەنێن (خەتمە) ودوای هەر(١٠٠٠هەزارجارێك)لەوزیکرە هەدیەی دەکات بۆمردووەکەی!!

٤٣-دوعازۆردەکات لەسەرگۆڕستان بەبیروباوەڕی ئەوەی کەلەگۆڕستان زیاتر دوعا گیرایە!!!

٤٤-هەنگاو نان وپێنان بە گۆڕی مرودووی تردا ودانیشتن لەسەر گۆڕەکان وگوێ پێنەدانی یاخود ئاژەڵ کردنە سەرگۆڕستانەکان!!!

٤٥-مزگـــەوت دروســـتکردن بەســـەرگۆڕەوە یـــان مردووناشـــتن لەمزگەوتدا(کەبەهیچ جۆرێك دروست نیە خۆئەگـەر مردوەکـە خرابێتـە ناومزگەوتەکەوە ئەوە دەبێت دەربهێنرێـت و ببرێتـە گۆڕسـتان بنێـژرێت، ئەگەر لەپێشدا گۆڕبوبێـت وکرابێتـە مزگـەوت لەسـەری ئـەوە دەبێـت ئەومزگەوتە بڕوخێنرێـت-کەئـەوە پێویـستە لەسـەر دەسـەڵاتدار یـاخود ئەوکەسەی کەمزگەوتەکەی دروستکردووە-)!!!

٤٦-دانانی قورئانێك لەســەر گـۆڕ بۆئـەوەی هەرکـەس چـو بەســەریدا بیخوێنێت!!!

٤٧-داواکـــردن لەمردووەکـــە کـــەدوعای بۆبکـــات لای خـــوای گەورە!!(دەبێت تۆداوا بکەیت لە خوا کەلە مردووەکەخۆش بێت، نـەك بە پێچەوانەوە)!!

٤٨-گوڵ وگوڵزاردانان لەسـەرگۆڕ-وەك ڕیحانـە وگوڵـە نێرگـز-یـان بۆیاخکردن وڕازاندنەوەی یان دارڕواندن لەدەوری گۆڕەکەدا، بـەبیانوی

ئەوەی سزانادرێت بەوهۆیەوە، یان مـۆم وئـاگر و بوغـورد داگیرسـاندن لەسەرگۆڕ وبۆنی خۆش سوتاندن لەسەری !!!

ئەمانـە وچـەندین خورافـەتی ترکـە حەقیقـەتیان نیـە لەشـەرعی خـوادا، وخەڵکی بەدینی دەزانن و بیروباوەڕیان پێیەتی وئـەنجامی دەدەن، پێویـستە ئاگاداربین وئەنجامی نەدەین، وخەڵکیش ئاگاداربکەین کە ئەوجۆرەکارانـە ناشەرعین . بۆزانیاری زیاتربڕوانە کتێبی:

(أحكام الجنائز وبدعها/للشيخ الألباني* وە کتێبـی الـشامل الميـسر في فقـه الكتاب والسنة/ج٢ص ٦٨-٨٤)

لەکۆتایدا داواکارم لەگـشت براوخوشـکێکی موسـوڵمان کەهەوڵبـدەن خۆیان فێری زانستی شەرعی قورئان وسوننەت بکەن (لـەلای کەسـانێکی متمانـە لەدینەکەیانـدا کەکەسـێکی شـوێنکەوتەی قورئـان وسـوننەت و سەلەفی صالح بێت ودوربێـت لەبیدعـەو خورافـەت)،وەهـەروەهاکتێبی زانایانی ئـەهلی سـوننە زۆر بخوێننـەوە تـافێر بـبن و لـەسەرچاوەڕاسـتەکە

وەفێربن, نەك بچن لای بیدعەچی یەکی گومڕاو نەزان فێـری دیـن بـبن و بەناوی دینەوە کۆمەڵە شتێك فێربن کەپێچەوانەی دینەکەیان بێت !!!

چیتر باچـاوبکەینەوەو بۆخۆمـان هـەوڵی فێـر بـوون بـدەین، تائەوەنـدە چاوەڕێی کەسێکی نەزان نەبین کەخۆی کردۆتە زاناو فەتوای هەڵــە مـان بۆبـدات، و ئێمــەش بیکەینــە دیـن لــەخۆمان , جاکەخوێندتــەوە بـۆت دەردەکەوێت کەئەوەی پێت گوتراوە ڕاست بوو یاخود هەڵە!!!

وەهەروەها بەوە فریو مەخۆ کەدەبینی کەسێکی بەحساب شـارەزا لــەدین یاخود مامۆستایەکی مزگـەوت، یـان کەسـێکی خوێنـدەوار دەچـێت بـۆ تەعزیەو بەژداری دەکات ئەوە بەڵگە نیـە بۆتـۆ(چـونکە ئێمـە فـەرمانمان پێکراوە شوێن شەریعەتی خوابکەوین، نەك شوێن کەسانی پێـچەوانەکاری شەهادەدار، یاخود مامۆستاوخوێندەواری پێچەوانەکاری شـەرعی خـوا)!! بەڵگە لەقورئان و فـەرموودەو کـرداری هاوەڵاندایـە(خۆئەگەر کەسـێك وایکرد پێویستە تۆداوای بەڵگەی لێبکەیت نەك کوێرانـە شـوێن هەڵــەی

خـەڵکی بکـەویت لەهەرپلەیەکـدابێت), ئەوانـەی کەبـەژداری لــەو تەعزیانــەدا دەکــەن لەبــەر عەیبــەو خــەڵك لــەخۆڕازی کــردن ومەصڵەحەتێکی فاشیلە(کەئێمەدەبێت لەوەژیرتربین کەمەصڵەتی دونیایی بخەینە پێش مەصـڵەحەتی دینمانـەوە، بۆیـە کەسێك ئەوەسـیفەتی بێـت کەسێکی ژیرنیە، بەڵکوکەسێکی فاشیل وسـەرنەکەوتووە لـە دینداریـدا) یان ئەوجۆرەکەسانە جاهیلن و نازانن کەناشـەرعیە(کەبەڕاستی پێویستە هەوڵبدەن فێربن وچیتر واز لەشوێن کەوتنی کوێرانە وبێ بەڵگـە بهێـنن) یان بەکوێرانە شوێن فەتوایـەکی هەڵەوناشـەرعی کـەوتووە ، یـان لـەبـەر بەرژەوەنـدی و خۆبردنــە پێـشەوە ی خـۆی و جەماعــەت و حــزب و گروپەکەیــــەتی تابگوترێـــت بـــەخوا پیــــاوی چـــاکن ، و پیــــاوی تەنگانەن(بۆیەدەبینرێت هەندێك جار لـەکاتی نزیـك بونـەوەی دەنگـدان وئینتیخاباتەکاندا زیاتر بەدەم تەعزیەی خەڵکیەوە دەچن، تادیاربن وببینرێن کەچەندە بەدەم خەڵکییەوەن!!!).

*وه لەكۆتای ئەم بابەتەدا زۆردەست خۆشی دەكەم لەو وەزارەتی ئەوقاف و زانایـانی بـەڕێزی لیژنـەی فـەتوای شـاری(كـەركوك) كەلـە سـاڵدا(٢٠١٣)فەتوایانـدا بەنەهێشتنی تەعزیـەو پرسـەگێڕان و بەئاشـكرافەرمویان ناشـەرعی وداهێنـراوە، داواكـارم لەگـشت بەڕێوەبەرایەتی و لیژنـەو زانایـانی گـشت شـارەكانی ترمـان هەوڵبـدەن بەلابردن ونەهێشتنی ئەم ناشـەعیەو فـەتوای ادروسـتێتی بـدەن هـەروەك زانایان فەرمویانە ناشەرعیە تابەڵكو ئەم بیدعە و ئەركە قورسە لابـدرێت لەسەرشـانی موسـڵمانان خـوای گـەورە هەمولایـەك موەفـەق بكـات بۆهەموكارێكی شەرعی و بمانپارێزێت لەهەموناشـەرعی و زیـاد كراوێـك كەدەهێنرێتە ناو ئیسلام....

لەبەر نەبوونی كات و زۆر درێژنەبوونەوەی بابەتەكە پێم خۆش بـوو بـە شێوازە كورتە بێت و زۆر درێژە نەكێشێت(بۆیـە لێـرەدا باسـی: مـردن، وسودەكانی مردن، وئایادروستە ئاوات بەمردن بخوازیت یان نا، وئەوجۆر حوكمانەی تر كەپەیوەست ونزیكن لەم باسەی ئێمەداباس نەكراون؟

**وەباسی نەخۆشی وفەزڵی نەخۆشی وفەزڵی سەردانی نەخۆش و......**

**ونوێژی مردووچۆنێتی شۆردن وکفن کـردن وناشـتنی مـردوو وەچـۆنێتی مردوو ناشتن و.....**

**لێرەدابە درێژی باسی هیچ کام لەمانـەم نـەکردووە بەڵکولـەم نوسـراوە بـچوکەدازیاتر تیـشك خراوەتـە سـەربابەتی (حـوکـمی تـە عـزیـە گیـڕان)ئـەویش بـە کـورتی و پـوختی تائاگادارکردنەوەیـەك بێـت بۆموسڵمانان، وە داوا دەکەم لە خوای بەرز بیکاتە هۆکاری چاوڕۆشـنی بۆ گشت لایەك بەیارمەتی خوای گەورە.**

**وەداوا دەکەم لەخوای گەورە بەڕەحم وبەزەی خـۆی بیکاتـە توێـشویەك بۆم لەگۆڕی تاریك وقیامەتێکی سەختدا... ئامین**

وسبحانك اللهم وبحمدك أشهدأن لااله الا أنت أستغفروك وأتوبوا إليك

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات والحمدلله رب العالمين.

## سەرچاوەکان

١-القرآن الكريم.

٢-صحيح البخاري.

٣-صحيح مسلم.

٤-سنن النسائي.

٥-سنن ابي داود.

٦-سنن ابن ماجه.

٧-مسندالإمام أحمد.

٨-صحيح ابن حبان.

٩-مستدرك الحاكم.

١٠-صحيح الجامع للألباني.

١١-سلسلة الأحاديث الصحيحة للإمام الألباني.

١٢-السراج المنير بترتيب صحيح الجامع الصغير عصام موسى هادي.

١٣-الإرواء الغليل للإمام الألباني.

١٤-المجموع شرح المهذب للإمام النووي.

١٥-أحكام الجنائز للإمام الألباني.

١٦-الأم للإمام الشافعي.

١٧-المغني لإبن القدامة المقدسي.

١٨-زادالمعادفي هدي خير العباد للإمام ابن القيم الجوزي.

١٩-الروض المربع في شرح زادالمستقنع للإمام البهوتي.

٢٠-حاشية الإعانة.

٢١-إصلاح المساجد من البدع والعوائد للشيخ محمد بن جمال القاسمي

٢٢-نيل الأوطار من أسرار منتقى الأخبار الإمام محمدبن علي الشوكاني.

٢٣-الحاوي الصغير.

٢٤-الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز للشيخ عبدالعظيم البدوي.

٢٥-صحيح فقه السنة وأدلته وتوضيح مذاهب الأئمة أبوكمال بن سيد السالم.

٢٦-الممتع على زادالمستقنع لإبن العثيمين.

٢٧-الحلال والحرام لإبن عثيمين.

٢٨-فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث ولإفتاء.

٢٩-كتاب المسائل لإبي داود.

٣٠-إقتضاء صراط المستقيم في مخالفة أصحاب الجحيم لشيخ الإسلام ابـن تيمية.

٣١-ملخص الفقهي  للشيخ صالح الفوزان.

٣٢-الشامل الميسر في فقه الكتاب والسنة محمدصبحي حسن حلاّق.

٣٣-أقوال منتقات فيمـاينفع الميـت والوالـدين بعـدالوفات وحكـم قـرآة القرآن عنالإحتضار-الدفن-زيـارةالقبور-وإهـداء الثـواب للأمـوات-مـع إدراج فتاوى اللجنة الدائمة وعلمـاء بلـدالحرام/ إعـداد: أبـو أنـس محمـد سليمان.

۞ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾ آل عمران: ١٨٥

۞ قال رسول الله ﷺ (( من عزى أخاه المؤمن في مصيبته كساه الله حلية خضراء يحبربها يوم القيامة ، قيل: يارسول الله ، يحبر؟ قال: يغبط )) الإرواء / ٧٥٦

۞ قال جرير بن عبدالله البجلي رضي الله عنه : ( كنا نعد الإجتماع إلى أهل الميت، وصنيعة الطعام بعد دفنه من النياحة ) رواه إبن ماجه وأحمد

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (      )ی ساڵی ٢٠١٣ پێدراوە